# ناوەڕۆك

# پێشەکی

## وەرگێڕانی ئەم پەرتووکە... بۆ...؟

بێگومان شتێکی تازەمان نەگوتووە گەر باسی هەژاری و سستی نووسین و لێکۆڵینەوە بە زمانی کوردی سەبارەت بە بابەتە پەروەردەییەکان بکەین، چونکە جگە لە چەند پەرتووك و کەمێك نووسینی نێو گۆڤارو ڕۆژنامەکان لەلایەن ژمارەیەکی کەم لە پسپۆڕان و مامۆستاو ڕۆشنفکری دڵسۆزەوە نەبێت ئەوا زیادەڕەوی نیە گەر بڵێین کایەی پەروەردەی کوردی کارەساتبارو نزیك لە پلەی سفرەوەیە.

بە وەرگێڕانی ئەم کتێبە- بەهۆی گرنگی و بایەخی بابەتەکانیەوە- هیوا دەخوازین بەشداریەکمان لە ڕەهەندێکی یەکجار هەستیارو پڕ بایەخی ژیانی نەتەوەکەمان کردبێت (هەرچەندە هەوڵێکی بچووکەو شایستەی پیاهەڵدان و ستایشکردن نەبێت)، خاڵی هەرە گرنگ و ئامانجی سەرەکی لەم وەرگێڕانەدا مەسەلەیەکی چارەنووسسازە لە ژیانی هەموو کۆمەڵگەیەکدا، کە ئەویش پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن)ە، چونکە وەك (نیتشە) دەڵێت: "هیچ نەتەوەیەك چاکسازی بەخۆیەوە نابینێت گەر پەروەردەی ڕۆڵەکانی گەندەڵ بێت".

سەرەتا نابێت ئەوە لەیاد بکەین کە پرۆسەی پەروەردە بە هەموو چالاکی و بەش و پێکهاتەکانیەوە نابێت دابڕاو لە کێشەو گرفت و بەرەنگاربوونەوەکانی کۆمەڵگە سەیر بکرێت، بەهەمان شێوەش ناکرێت ئەمانە گرێدراوی ناوەوەی ئەم پرۆسەیە بکرێت (واتە تەنها بکرێنە کێشەی مامۆستایان و فێرخوازان و پەروەردەکاران)، بەڵکو بکرێنە خەمێکی سەرەکی و پرۆژەی بنەڕەتی لە پرۆسەی بونیادنانی مرۆڤێکی تاکی ئازادی داهێنەر، ئاراستەی ئامانجەکانی کۆمەڵگەش بن لەڕووی فەلسەفی و ئایینی و کۆمەڵایەتی و لایەنەکانی دیکەی ژیان، هەروەها بکرێنە کایەی کاری هەموو ئەو کەسانەی خەمخۆرو دڵسۆزی نەتەوەکەیان و مرۆڤایەتین لەپێناو بەدیهێنانی نوێکردنەوەو گۆڕان و بەرەوپێشچوونێك کە ببنە پاڵنەر بۆئەوەی نەتەوەی ئێمەش شانبەشانی مرۆڤایەتی توانای هەنگاونانی هەبێت بەپێی ئەو گۆڕانکاریانەی هاتوونەتە ئارا، کۆمەڵگەی کوردیش لە هەوڵی بونیادنانی ژیانێکی لەو جۆرە بێت کە بەشی هەرە زۆری ویست و خواستی تاك و کۆمەڵ فەراهەم بکات.

وەك ئاشکرایە گەر هەوڵدان و بەدواداچوون و کاری لێبڕاوانەو دڵسۆزانە لە هەر بوارێك کە جێگەی ویست و مەبەست بێت ئەنجام نەدرێت، ئەوا لەتوانادا نابێت تەنها هەنگاوێکیش بەرەوپێش بچین و هەر لە شوێنی خۆمان دەمێنینەوەو ئەو بارودۆخەی کە هەمیشە ڕەخنەی لێدەگرین و گلەیی و گازندەی دەکەین وەك خۆی بگرە خراپتریش دەبێت.

وەرگێڕی ئەم پەرتووکە زیاد لە (١٥) ساڵ لە بواری پـەروەردەو فێرکردنـدا کاردەکات. وە بە کرداریی لەنێو کێشەو گرفت و ئاستەنگەکانی ئەم پرۆسـەیەدا ژیاوە، ئەمـەش ئەو هەلەی بۆ ڕەخساندووە بە واقعی لەنێو زۆرێك (گەر هـەموو نەبێت) لەو گرفت و کەموکورییەی ڕووبەڕووی ئەم پرۆسەیە دەبێتەوە، درك پـێ بکات و هەر ئەم هۆیانەش پاڵنەر بوون کە مەسەلە پەروەردەییەکان بکاتە کایەی کارکردن و بەشێکی بەرچاو لە کات و ماندووبوونی بۆ تەرخان بکات.

وەك پێشتر ئاماژەمـان بـۆ کـرد سـەرەکیترین ئامـانج لـەم وەرگێڕانـەدا هەستکردن بووە بە لێپرسراوێتی بەرامبەر بە مەسەلەی نوێکردنەوەو گۆڕانێك کە بەو جۆرە بێت کایەی پـەروەردەی کـوردیش وەك گـەلان و نەتـەوەکانی دیکـە بتوانێت شانبەشانی هەنگاوە تیـژو خێراکـانی زانـست و تەکنـەلۆژیاو زانیـاری ڕێکات و ڕۆڵەکانی ئەم نەتەوەیەش پـشکێکیان هـەبێت لـە خزمـەتکردن بـە مرۆڤایەتی ... ئەمەش لەو ڕێگاوە دێتە دی تـا لـەتوانادا بێـت ئـەو گرفـت و کۆسپ و ئاستەنگانەی دێنە بەردەم ئەم پرۆسەیە لـە سـەرەتا دیـاری بکـرێن و سنورەکانیان دەستنیشان بکرێن، پاشان بەراورد بکرێن لەگەڵ ئەزموونی وڵاتانی پێشکەوتوودا، وە پێشنیاری چارەسەری لەبارو گونجاو بکرێت، نەك لەقاڵبـدان و بەزۆر سـەپاندنی ئەزموونی گـەلانی تـر بەسـەر پرۆسـەکە ئـەنجام بـدرێت، بـۆ دواجاریش بەرنامەڕێژی و پلانی نەقڵیانە دابڕێژرێت کە ئاسانکارو ڕێخۆشکەر بن لە هێنانەدی ئەم ئامانجە بەرزو بەشکۆیە. کاتێك ئێمـە ئەمانـە دەڵـێین، ئـەوا

مەبەستمان چارەسەرێکی سەرتاسەری و کوتوپڕ نیە کە لەشەو و ڕۆژێکدا، یا لە ماوەیەکی پێوانەییدا هەموو کێشەو گرفت و ئاستەنگەکان لەناو بەرێن و شێوازێکی نموونەی و بێ کەموکووڕی بهێنرێتە دی، بەڵکو هەر هەوڵێکیش با بچووک و کەمیش بێت دەکرێت ببێتە هەوێنێک، یاخود بەردێك لەو تەلارەی کە دەمانەوێت دروستی بکەین، واتە بەشدار دەبێت لە بونیادنانی پرۆسەیەکی پەروەردەییانەی هاوچەرخ.

زۆرێك لەوانەی لە بواری پەروەردە کار دەکەن ئێستا توشی هیوابڕانێك و ڕەشبینیەکی ئاشکرا بوون، چونکە ئەوەندەی لایەنی خراپ و کەم و کوڕی لەم پرۆسەیەدا بەدی دەکرێت ئەوەندە لایەنی باش و پۆزەتیڤ نابینرێت، بەڵام لە ڕاستیدا دەبێت هەموان بە دیدێکی پێچەوانەی ئەم بۆچوونە کار بکەین، چونکە گەر بە تەنها باسی ڕێگرو گرفتەکان بکەین، وە تەنها تیۆریانەو لە کۆڕو کۆبوونەوەو شوێنی کارکردنمان ڕەخنە بگرین و گلەیی و گازندە دەربارەی دۆخەکە بکەین، نەك هیچ دەسکەوتێکمان نابێت، بەڵکو ئەوەندەی دیکە بەشداری لە وێرانکاری ئەم کایە هەستیارە دەکەین.

بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیەش ئاستی پێشکەوتوویی و پەرەی لایەنە جیاوازەکانی ژیانی کۆمەڵگە پێشکەوتووەکانی جیهانی ئەمڕۆمان بە چاوێکی واقعیانە سەیر کەین، نابێت ئەو پلە بەرزەی پێشکەوتنی ئەوان وامان لێ بکات دەستی حەسرەت لەسەر ئەژنۆمان دابنێین لەبەرئەوەی تازە ئێمە ناگەینە ئەو ئاستەی ئەوان گەر هەر

کایەیەك لە ژیانی میلەتەکەمان بەراورد بکەین بە یەکێك لەو وڵاتە پێشکەوتووانە، بۆ نموونە: رۆشنبیری، وەرزش، زانست، هونەر، وێژە... هتد.

ئەوا بەراورد بەو ئاستەی ئەوان پێیگەیشتوون کایەکانی ژیانی کۆمەڵگەی ئێمە لە بارێکی کارەسات ئاسادایەو لەچاو ئەواندا چەند سەدەیەك لەدواوەین، ئایە ئەم راستیە دەبێت بمانگەیەنێتە ئەو باوەڕەی کە ئێمە تازە چیمان پێ دەکرێت؟! لەبەرئەوەی ناگەینە ئاستی پێشکەوتنەکانی ئەوان، ئیتر بۆچی هەوڵ بدەین؟!! گەر بەم رەشبینیەو رۆحیەتە لاوازەوە بیرکەینەوە ئەوا نابێت وەرزش، رۆشنبیری، زانست، هونەر، ... نە هیچ جوڵەیەکمان لەم ژیانەدا بۆ دەکرێت، بەڵام راستی مەسەلەکە وەك هەموومان دەیزانین ئەوانیش لە سەرەتا هەروەك ئێمە بوون، بگرە لە ئێمەش کەمتر بوون.

بۆئەوەی لە بابەتی مەبەست دوورنەکەوینەوەو گرنگی و هەستیاری ناوەرۆکی ئەم وەرگێڕاوە رووونکەینەوە، یەکێك لە برگەکانی کتێبی (فەلسەفەی ئایین و پەروەردە)ی نووسەری مەزن (عبدالرحمن البدوي) دەخوازین کە دەڵێت: "دوو دۆزینەوە لە ژیانی مرۆڤایەتیدا ئێجگار گرنگ و بایەخداربوون، یەکەمیان: هونەری فەرمانڕەوایەتی و دووەمیان: هونەری پەروەردەکردنە". ئێمەش لە سۆنگەی ئەم دیدو بۆچوونەوە ئەم هەوڵە بچووکەی خۆمان دەخەینە بەردەستی خوێنەری کورد زمان، بۆئەوەی رۆڵ و کاریگەریی و دەرەنجامەکانی پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن بە ئاراستەیەکی زانستیانەو لۆژیکیانە کە لەم کتێبەدا هاتوون

بکرێنە هەنگاوێك و هەوڵێکی دیکەی کەسانی دڵسۆزو بەتەنگەوە هاتووی ئەم پرۆسەیە بۆ گۆڕین و بە گوڕترکردنی تواناو وزەی پراکتیزەکردنی ڕاستی و زانیاری و ئەنجامە وەدەستهاتووەکانی مرۆڤایەتی بۆ دروسبوونی تاکێکی کوردی کە شایستەی ئەم ژیانە گەردوونیەی ئێستا بێت، چونکە ئەرکی پەروەردە لەوە تێپەڕیوە کە تەنها ئامانجی بونیادنانی کەسێتی هاوڵاتی بێت لەڕووی زانستی و ئاکاری و لایەنەکانی دیکەی ژیان، بەڵکو پەروەردەی ئێستا ئەوە دەخوازێت کە مرۆڤێکی گەردوونی بێنێتە ئارا.

لە پێشەکیەکی کورتی لەم جۆرە ناکرێت هەموو لایەن و ڕەهەندەکانی ئەم پرۆسەیە بەشێوەیەکی تێروتەسەل تیشکیان بخرێتە سەر، بەلام هەوڵ دەدەین بەشێوەیەکی کورت و خێرا ئاماژە بە بوونی هەندێك لەو گرفتە سەرەکیانەی کە پەروەردەی ئەم وڵاتە بەدەستیانەوە دەناڵێنن بیخەینە ڕوو، ئەو ئاستەنگانەش بوونەتە هۆی ئەو بستی و چەقبەستنەی کە لەم ڕۆژەدا هەستیان پێدەکرێت:-

١- کایەی پەروەردەو فێرکردن لە وڵاتی ئێمەدا تەواو لەژێر کاریگەری کۆمەڵایەتی و کلتوری و ئایینی و ئایدۆلۆژی باوی کۆمەڵگەدایەو نەیتوانیوە هیچ (تجاوز) تێپەڕاندنێك لەم یەکانەی باسکران بکات، بەڵکو تەواو دووپاتکەرەوەو جێگرەوەی ئەوان دەکەن، تەنانەت هەندێك لەو میکانیزمانەی کە ناکرێت لەو کایانەدا جێبەجێ بکرێت لەناو پرۆسەی پەروەردەییدا جێیان کراوەتەوەو درێژەپێدەری ئەو بارودۆخەن کە تا ئێستاش تاکی کورد باجەکەی

دەدات، ڕۆشنبیری گەورەی گەلەکەمان (بەختیار علی) زۆر وریاو زیرەکانە ئەمەی لە ڕستەیەکدا چڕکردۆتەوە:- ((گەر ئێمە بەهەمان زمان قسە لەگەڵ یەکدا بکەین.. ئەوا هەمان مێژوو دووپات دەکەینەوە)).

٢- لادان و داخزانی پرۆسەی پەروەردەیی لە ئاڕاستەی ڕاستەقینەی خۆی، بەهۆی بە کەلتوربوونی هەندێك بۆچوون و بیرکردنەوەی نازانستیانەیە، کە ئەمانە دەبنە مۆدێلێك و بگرە پێوەری پەروەردەو هەڵسەنگاندنی یەکەکانی ئەم پرۆسەیەیان پێ دەکرێت، لەو چەمك و زاراوە نازانستی و نابابەتیانە (مامۆستای بەتوانا -خوێندکاری نموونەیی- خوێندنگەی نایاب)، کە ئەمانە خۆیان جیاکردنەوەیەکی نالۆژیکی و دابەشکردنێکی (باشەو خراپە) بێ هیچ پێوەرێکی زانستیانەو سەلمێنراو لە وڵاتانی پێشکەوتووی جیهاندا. لەم جۆرە بیرکردنەوەیەدا سیستمێکی پەروەردەو فێرکردنی لەو جۆرە دێنەکایەوە، کە فێرخواز دەبێتە بەکاربەرێکی (مستهلك) ڕووکەشی زانست و زانیاریەکان، چونکە ئەوەی لەم جۆرە سیستەمەدا دەخوازرێت تەنها لەبەرکردنی بابەت و گێڕانەوەی ئەو بابەتانەیە لە کاتی تاقیکردنەوەکاندا، بەتایبەت تاقیکردنەوە چاردنووسسازەکانی (شەشەمی ئامادیی و پیشەییەکان). دەرەنجامی ئەم کارەش لەدەستدانی توانای پرسیارکردن و ڕەخنەگرتن و داهێنان و سەرکوتکردنی حەزو بەهرەو لێهاتووی خوێندکار دەگەیەنێت، ئامانجی خوێندکاریش لەم سیستەمەدا تەنها بەدەستهێنانی نمرەی بەرزە، یاخود قۆناغ بڕین دەبێتە دوا مەبەستی فێرخواز، نەك (چی) فێربووە

و (چۆن) فێرکراوەو دەتوانێت (چی) بکات؟!! ئەم خاڵە نێگەتیڤە کاریگەری لە خوێندکارەوە دەگوێزێتەوە بۆ سەر مامۆستایانیش، چونکە مامۆستاش ئەوەی لێی دەخوازرێت کە خوێندکارەکانی پلەی بەرزو باڵا بەدەست بهێنێت، وە ئەوانیش پەروەردەکراوی هەمان سیستمن، ئەوا ئامانجی ئەمانیش بەپێی ئەم جۆرە بیرکردنەوە و بۆچوونە نازانستیە ڕێدەکات و کاری سەرەکی خۆیان دەکەنە: ئاسانکردنەوە، کورتکردنەوە، گەیاندنی زانیاری نەك لەپێناو خودی زانیاری، بەڵکو بەمەبەستی نمرەهێنان و پێوەری دەرچوون، هەمووش دەزانین ئەمانە دەکاتە لەناوبردنی ڕۆحی داهێنان و سەرکوتکردنی ئەو بەهرەو توانا تاکە کەسیانەی فێرخوازو مامۆستاش خاوەنیانن.

٣- هەر ئەو بۆچوونەی سەرەوە کاریگەریشی لەسەر پلاندانەران و نەخشەسازی پەروەردەی ئەم وڵاتە داناوە، وەك دەزانین لەدوای ڕاپەڕینەوە هەوڵێکی دڵسۆزانە لەم پرۆسەیەدا خراوەتە گەڕ -با زۆر بواریشی پێنەدرابێت-. ئەو کاریگەریە لەوەدا ئاشکرا دەبێت و بە نائاگایی کاری خۆی دەکات، ئەویش لە گۆڕانی هەندێك لە بابەتەکاندا بەدی دەکەین، بۆ نموونە گۆڕین و دەستکاریکردنی بابەتی زمانی عەرەبی لە هەموو قۆناغەکاندا، دەبینین ئەو گۆڕانکاریە گۆڕانکاریەکی چەندایەتیە نەك چۆنایەتی (كمية وليست كيفية) واتا هاتوون بابەتەکانیان کەمکردۆتەوە، ئێمە دژی کەمکردنەوە نین، بەڵام باپلان و ئامانجێکی زانستیانەی لەپشت بێت، ئێمە وەك تێبینیەك سەرنجی خۆمان لە

پرسیارێکدا دەخەینە ڕوو دەڵێین:- گەر فێرخواز بەو بابەتە زۆرەی پێشتر هەبووە ئەنجامەکەی ئەوە بێت کە دەیبینین.. ئێ ئەگەر کەمتر بکرێتەوە چی ڕوو دەدات؟!!، بۆیە دەڵێین گۆڕانکاری لە چەندایەتیە نەك چۆنایەتی و پشت ئەستوریش نیە بە پسپۆڕێتی و لێزانیەکی تەواو.

بۆ کاراکردنی پرۆسەی پەروەردەیی و بەدیهێنانی ئامانجەکانی پێویستمان بە وروژاندنی چەند پرسیارێك دەبێت کە وەڵامدانەوە یان دەبێتە بنەماو پاڵپشتی بەهێز بۆ چالاکی و خۆڕاگری و توانای بونیادنانەوەی پرۆسەی پەروەردەیی، بەو جۆرەی کە ئەم کایەیەی ژیانی کۆمەڵگەو ڕابردوو بە ئێستاوە گرێدرابێت و ئاوێتەی داهاتوو بکرێن تا مرۆڤ و تاکی شایستەو لێهاتووی ئەم سەردەمە پەروەردە دەکرێت:-

أ- ئایا ئەو بابەتانەی ئێستا دەخوێندرێن زانیارییە نوێ و سەردەمیەکان لەخۆ دەگرن؟

ب- ئایا ئامانجە پەروەردەییەکان کە لەنێو ئەو پرۆگرامەدا هەن لەگەڵ کێشەکانی سەردەمدا دێنەوە؟

ت- ئایا پرۆگرامەکانی خوێندن لەڕووی توانای پراکتیزەکردنیان، یاخود بڕی تێچوون، یا لایەنەکانی فەلسەفی و ئیستاتیکی و ئاکاری و شێوازی خستنەڕوو و ئاستی زمانەوانی، دشێت تا چەند لەتوانادا بن جێبەجێ بکرێن.

چەند پێشنیارێك گەر ئامادەییان هەبێت لە كاتی دانان، یاخود گۆڕانكاری و دەستكاریكردنی بابەت و پرۆگرامەكانی خوێندن، ئەوا گۆڕێكی بەتینتر دەدەنە پرۆسەكەو یارمەتیدەری پسپۆڕان و لێپرسراون و پەروەردەكارانە، گەر بەشێوەیەكی زانستی و بابەتیانە ڕەچاو بكرێن:-

١- برەودان بە شێوازی بیركردنەوەی زانستیانەو بابەتیانە.

٢- برەودان بە توانایی و لێهاتوویی و لێزانی لە چارسەری كێشەو گرفتەكاندا.

٣- برەودان بە توانای ڕەخنەڕاڤەكردن، داهێنان.

٤- بەئاگایی و وشیاری لە جیاوازیەكانی نێوان توانایی و لێهاتوویی تاكەكان.

٥- پەرەدان بە حەزو ویست و ئارەزوو و تواناكانی فێرخوازو ئاڕاستەكردنیان بەرەو كاركردن و بەرهەمهێنان.

دەقی ئەم كتێبە لە بنەڕەتدا بە زمانی عەرەبی لەلایەن گەورە پسپۆڕی عەرەب لە بواری پەروەردە و پلاندانەری پەروەردەییانە -أستاذ التخطيط التربوي- (د. أحمد علي الحاج محمد) نووسراوە لەژێر ناونیشانی (في فلسفة التربية) كە لە زنجیرەی كتێبی پەروەردەیی دەزگای (دار المناهج للنشرو التوزيع)ە، چاپی دووەم سالی (٢٠٠٣ ز) / عمان- ئەردەن.

باسێکی تیۆریانەی فەلسەفەی پەروەردەییەو کۆمەڵێك لە و ڕێبازە فەلسەفیانە لەخۆ دەگرێت کە کاریگەرێتی ڕوون و ئاشکرایان لەسەر پرۆسەی پەروەردەدا هەبووە. جگە لە بابەتی سەرەکی کە شیکردنەوەو لێکدانەوەی چەمکە پەروەردەییەکانە، سەرەڕای بنەماو پێکهاتەی پەروردە، هەروەها پراکتیزەکردنی چەند ڕێبازێکی فەلسەفیانەیە لە بواری پەروەردەدا لەخۆ دەگرێت و بۆچوونی فەلسەفیانەی کۆن و نوێی جیهان سەبارەت بەپەروەردە دەخاتەڕوو.

بەو پێیەی دانەری کتێبەکە پلەی (استاذ التخطيط التربوي) هەیە لە زانکۆی صنعاء- یەمەن پاشکۆیەکی چەند لاپەڕەیی تەرخان کرابوو بە پەروەردە لە وڵاتی یەمەندا، بەڵام ئێمە تەنها چەند بەشێکی سەرەکی کتێبەکەمان وەرگێڕا واتا (في فلسفة التربية) بەهۆی هەستیاری و زیندوویی ئەو بەشەو سازگاری و گونجاندنی تاڕادەیەکی زۆر بەسەر پەروەردە لەم وڵاتەدا...

لە کۆتاییدا بەو هیوایەین گەر کەلێنێکی با بچووکیش بێت بەم هەوڵە ناشایستە پڕبکرێتەوە ...

**طه محمد ئەمین قەرەداغی**

**٢٠٠٧/٦/١٥**

## یەکەم:- چەمکی پەروەردە

چـەمکی پـەروەردە بەهـەمان شـێوەی چـەمکگەلی (ئـازادی، فەلسەفە،بەختەوەری ..) ئاوێتەی تەمومژێکی ئێجگـار زۆر بـووە، بەرادەیـەك تێگەیشتنێکی سەراپاو گشتگیری ئەم چەمکە بۆتە کارێکی سەخت و دژوار ، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چەندین کاریگەریی و فاکتـەری تێکئـاڵاو، هەنـدێکیان دێرینـەن وەك لـەرووی: بـارودۆخی تایبـەتی هـەر کۆمەڵگایـەك و بەرەنگاربوونەوەکانی و ئاستی بەرەوپێشچوونی ئـەو کۆمـەڵگەیـە، هەنـدێکی دیکەش پەیوەستن بە ئایندەوە وەك ئەوەی تاکە کەسەکان چ چاوەڕوانییەکیان لەو داهاتووەدا هەیەو دەبێت چ شتێك بهێنەدی .

ڕەنگە زۆرێك لە جیاوازی و لێکنەچوونەکان سـەبارەت بـە پـەروەردە لـە چەندین پاساو و هۆکارو بەهانەوە سەرچاوە یان گرتبێت کە بۆ خۆیان دەرەنجامی سروشتی پەروەردە بن و هەندێکی دیکەیان هەڵقوڵاوی خودی کۆمەڵگە بن .

**ئەو هۆکارانەی لە خودی پەروەردەوە سەرچاوە دەگرن ئەمانەن:**

- لەبەرئەوەی پەروەردە ئامرازێکی بەکۆمەڵبوونە. ئـەوا ئـەم پرۆسـەیە ڕەنگ و ڕووخساری بەپێی واقعی کۆمـەڵگەکان دەبێت.

- پەروەردە چەند پرۆسەیەکە: کوتکردنەوەی ڕابردوو، ئاڕاستەکردنی ئەو ڕابردووە بەرەو ئێستا، وردەکاری و گۆڕانەکانی ئێستاو ڕۆشتن بەرەو داهاتوو و پێکهێنانی ئەو داهاتووەش لەخۆ دەگرێت.
- لە خسڵەتەکانی پەروەردە گۆڕانی بابەتەکانی و نوێگەری شێوازەکانیەتی.
- ئاوێتەبوون و یەکداچوونی پرۆسەکانی پەروەردە لەگەڵ دامودەزگاکانی دیکە.

**ئەو هۆکارانەی هەلقولاوی خودی کۆمەلگەن بریتین لە:**

- پێکهاتەی کلتوریی و بەهاو شێوازی ژیانی ئەو کۆمەلگایە .
- بارودۆخی کۆمەلآیەتی و ڕامیاری.
- ئەو قۆناغی بەرەوپێشچوونەی کۆمەلگەی پێدا تێدەپەڕێت.
- ئەو بەرەنگارییانەی دێنە ڕێی پێشکەوتن وپەرەسەندنی ڕێڕەوی ئابووری.
- خواست و پێداویستیەکانی ئێستاو داهاتوو.
- ئاستی پشتبەستنی کۆمەلگە بە زانست و تەکنەلۆژی .

ئەمانەو چەندین خالی دیکە بونیادی پرۆسەی پەروەردەیی دیاری دەکەن، ئەرک و ئاماتجەکانی دستنیشان دەکەن و دەبنە هۆکاری لێکنەچوون و جیاوازی

چەمکی پەروەردە لە کۆمەڵگایەکەوە بۆ کۆمەڵگایەکی دی و لە سەردەمێکەوە بۆ سەردەمێکی تر.

دیدو بۆچوونی زانایان، لێکۆڵەروان، بایەخپێدەرانی بواری پەروەردە جیاواز دەبێت بەپێی:-

- دیدی فەلسەفیان.
- بیروباوەڕی ئایینیان.
- پسپۆڕێتیان.
- پێشینەی ڕۆشنبیری و ڕامیاریان.
- ئاستی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ئەرکەکانیان.
- شێوازی پەروەردەبوونی خۆیان.

ئەمانەی ئاماژەمان پێدان هۆکاری لێکنەچوونی چەمکە پەروەردەییەکان بوون.

جیاوازی ئەو دیدو بۆچوونانەی باسکران ڕەنگدانەوەیەکی ڕاستەوخۆیان لەسەر پرۆسەی پەروەردەیی هەیە،لە دەرەنجامیشدا پێناسەو تێگەیشتنی جۆراوجۆر دەبەخشنە پەروەردە، بۆ نموونە سیاسەتمەداران بەجۆرێك لەپەروەردە دەڕوانن کە دوامەبەستی پرۆسەکە بەدیهێنانی ئامانجەکانی سیستمی فەرمانڕەوایەتیە جا چ حوکمێکی دیموکراسی، یا دیکتاتۆری، یاخود میللی یا ڕەگەزپەرستی بێت، بەڵام کۆمەڵناسان وای بۆ دەچن پەروەردە ئامرازە بۆ هەڵکردن و گونجاندنی تاکە

کەس لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیدا، دیدی زانایان بۆ پەروەردە پسپۆڕێتی زانستیانە لەخۆ دەگرێت، لە کاتێکدا تێبینی ئەوە دەکەین لای زانایانی زانستە کۆمەڵایەتیەکان کە پەروەردە هەڵگری ناوەڕۆك و ڕەهەندی بواری زانستە کۆمەڵایەتیەکان بێت .

تەنانەت ئەم جیاوازی و لێکنەچوونە سەبارەت بە چەمکی پەروەردە ڕۆچوونەتە نێو خەڵکانی سادەو بەشێکی زۆریان ئەوەندە لە پەروەردە تێدەگەن کە کایەی پەروەردە تەنها جێگای فێربوونی بابەتەکانی خوێندنەو بەس، بۆچوونی ئەمانە سەبارەت بە پەروەردە لەمە تێپەڕ ناکات .

جگە لەو هۆیانەی ئاماژەیان پێدرا سەرچاوەیەکی تری لێکنەچوون و جیاوازی پەروەردە هەڵقوڵاوی ئەو ماناو لێکدانەوە جۆراوجۆرانەیە کۆمەڵگاکان، یاخود ڕێکخراوە نێودەوڵەتیەکان، یاخود سەنتەرەکانی لێکۆڵینەوە دەیبەخشنە پەروەردەو لە کاتی تێڕوانینیان بۆ ئەم پرۆسەیە پشتیان پێدەبەستن. خودی پەروەردەش لە دروستکردنی ئەم جیاوازیانەدا بەشدارە، چونکە دەبینین لێکنەچوون وناکۆکی لەنێوان ئەنجامدەرانی پرۆسەی پەروەردەیدا ئامادەیی هەیەو بەشێکی زۆریان بە واتاو چەمکی جیاوازەوە دەربارەی پەروەردە دەدوێن، هەرچەند لەڕێی داڕشتن و بڵاوکراوە فەرمیەکانەوە هەوڵدەدرێت ئەم جیاوازیانە لەناو ببرێن و ڕیشەکێشبکرێن، ڕاستی ئەم مەسەلەیەت کاتێك بۆ دەردەکەوێت کە پرسیار ئاڕاستەی ئەو کەسانە دەکەین لەم بوارەدا کاردەکەن بەتایبەت

ماموٚستایان سەبارەت بە هەندێك لەو چەمك و مانایانە دەبینین ڕاڤەو لێكدانەوەی جۆراوجۆر دەبەخشنە مەسەلە پەروەردەییەكان.

بەهەرحاڵ ئەو بۆچوونانەی دەربارەی پەروەردە هەن گەر بە تەنها سەیریان بكەین خەوشدارن و كورت دەهێنن، چونكە هەر یەكەیان لە گۆشەنیگای تایبەت بە خۆیەوە مانا دەدەنە پرۆسەكەو لایەنێك، یا چەند لایەنێكی كایەكە دەخەنەڕوو بێئەوەی دیلو بۆچوونێكی سەراپاو گشتگیریان هەبێت. بێگومان جیاوازی و لێكنەچوونی پەروەردەكاران و ئەنجامدەرانی دەبنە ناتەواوی و كەم و كوڕی چەندین پەشێوی و ئاڵۆزی و ناڕوونیان لێدەكەوێتەوە، ئەمانەش دەرەنجامی مەترسیدار لەسەر پەروەردەو كۆمەڵ جێدەهێڵن، دەرەنجام چەند لایەنێكی نێگەتیڤی وەك ئەمانەی لای خوارەوە دێنە ئارا:

- پیادەكردنی پرۆسەكە بە شێوازێكی هەڕەمەكی و نازانستیانە، بەمەش پەروەردە دەبێتە مەیدانی هەوڵ و بۆچوونە تاكە كەسیەكان، بۆیە پەروەردە گرنگترین بنەمای سەركەوتنی لەدەست دەدات.

- دروستبوونی ڕاوبۆچوونی ناكۆك و دژبەیەك لەنێوان ئەنجامدەرانی پرۆسەكە، وەك ڕێكنەكەوتنی دانەران و جێبەجێكەرانی پرۆگرامەكان و ماموٚستایان لەلایەك سەرپەرشتیاران و بەڕێوەبەران و بەڕێوەبەرێتییە گشتیەكان لەلایەكی دیكەوە.

- دابڕینی تیۆر لە پراکتیك، فكـر لـە واقـع، ئەمـەش دەرەنجامەكـەی دووركەوتنەوەی بنكە دەبێت لە لوتكە (واتا فێرخوازان و فێركـاران، دەسـەڵاتی بڕیاردەر)، هەروەها دووری نێوان پلاندانەران و جێبەجێكاران.

- ناڕوونی لە جێبەجێكردنی چالاكییە پەروەردەیـەكان و ئەركـەكانیان، ئەمەش فێركردن لە هێنانەدی ئامانجەكەی دوور دەخاتەوە .

- ژمارەیەكی زۆر لە هەڵسوڕاوانی بواری پەروەردەیی بەپێی ڕێنمایەكان (دەقاودەق- بەبێ لادان) كاردەكەن، بەمەش پەروەردە ڕۆحی دڵسۆزی و داهێنان و زیندوویەتی لەدەست دەدات .

- پەروەردە یەكێتی و ڕێكەوتنی نێوخۆیی ون دەكات وپاشـان ڕێـڕەوی ڕاستی لەدەست دەچێت.

- بەفیڕۆدانی زیاتری پەروەردەیی مرۆیی و بڕی تێچوون و خـەرجی كـە دەبنە هۆی دابەزینی ئاستی كارابوونی پرۆسەكە.

بەپێی ئەو خاڵانەی ئاماژەیان پێدرا ڕوون دەبێتەوە ئەو جیاوازیانەی لە واتاو ئاماژە پەروەردەییە ڕاستەقینەكاندا هەن چەند مەترسیدارن، وە ژمارەیەك كـەم وكورتی دێننە ئارا، كۆسپ و ناتـەواوی دروسـت دەكـەن كـە بـزاوت و هێـزی پەروەردە پەكدەخەن، دەبنـە بەربەسـت و تەگـەرە لەبـەردەم ئـەو ئامانجانـەی پەروەردە لەپێناویاندا هاتۆتە ئارا.

لە دەرەنجامدا دەڵێین تێگەشتنی ورد، یا لایەنی کەم بوونی بڕێك لە تێگەشتنی هاوبەش لای پەروەردەکاران دەبێتە هۆی خاوکردنەوەی ئاڵۆزیەکان و دژایەتیەکان. دوا بەدوای ئەمەش نزیکبوونەوەی دیدو بۆچوونەکان ڕێگایەکی ڕوون و ئاشکرا دەڕەخسێنێت، وە تێگەشتنێکی هاوبەش دروست دەکات کە پەروەردە بەرەو ئاراستە ڕاستەقینەکان دەبات و ئەرکەکانی سەرشانی جێبەجێ دەکات.

## تێگەشتنی نوێ بۆ پەروەردە:

لە زمانی عەرەبیدا (پەروەردە– التربیة) چاوگی فەرمانێکی چوار پیتیە (ربّی). هەوڵدەدەین بەپێی چەند فەرهەنگێکی زمانی عەرەبی ماناکانی ئەم فەرمانە لێکبدەینەوە:-

**مانای یەکەم:** واتا زیادکردن و گەشەکردن (الزیادة و النماء)

**مانای دووەم:** بە مانای خۆراکدان و چاودێریکردن دێت (یفید التغذیة و الرعایة)، مەبەست گەشەکردنی جەستەیی و ئەقڵی (ژیری) و ڕەوشتیە.

**مانای سێیەم:** (رَبّ) بمعنی أصلح و ساس: واتا چاکسازی سیاسەتکردن، چونکە لای عەرەب (السیاسة) مانای دوورکەوتنەوە لە هەڵەو چاککردنی خراپەکانیش دەگرێتەوە.

کەواتـە پـەروەردە، گەشـەکردن، بەرزبوونـەوە، زیـادکردن، بەرەوپاشـبوون دەگرێتەوە، ئەم زیادکردنەش ماوەیەکی دیاریکراو و سنووردار ناگرێتەوە، بەڵکو چاودێری و گەشەکردنێکی بەردەوامە لە هەموو کات و قۆناغـە جیاوازەکـانی تەمەن، هەر لەبەر ئەمەیە دەبینین پەروەردە شێوازو ڕێگـەی جۆراوجـۆر لـەخۆ دەگرێت، چونکە بەپێی ئاستی گەشەکردن و تەمـەن و بـارودۆخی کەسـەکان و پێداویستیەکانیان دەگۆڕێت، بۆیـە گەیشتن بـە پەرەسـەندنێکی بایەلۆژیانـەی هاوسەنگ، واتا ئامانجی چەندایەتی (ألکمي) پەروەردە دەدات بەدەستەوە، بەڵام ئامانجی چۆنایەتی (الکیفي) لە هێنانـەدی گەشـەی ئـەقڵی سـۆزداریدا خـۆی دەبینێتەوە*.

---

*لـە زمـانی عەرەبیـدا (التربیـة) پێـچەوانەی (الـتهجین، التطبـع)ە، چـونکە (الـتهجین) دەستێوەردانێکە بۆ گۆڕینی خەسڵەتی بایۆلۆجیانەی ڕووەك، یـا ئـاژەڵ، لـەم پرۆسـەیەدا ئاژەڵەکـە، یاخود ڕووەکەکە هەندێك لە تایبەتمەندییەکانی خۆی لەدەسـت دەدات، بـەڵام پـەروەردە بریتیـە لـە گەشـەکردنی بایۆلۆجیانـەو ڕێکخـستنیان لـە چوارچـێوەیەکی کۆمەڵایەتیـدا.(الترویـض): جـۆرە سەپاندنێکی دەرەکیانە دەگەیەنێت بەسەر ئاژەڵدا کـە ئاگـایی (الـوعي) ئامـادەیی لـە پرۆسـەکەدا نییەت ئاژەڵەکەش خۆویستانە ئەم کارە جێبەجێ ناکات، بەڵکو پـاش زنجیرەیـەك مەشـق و ڕاهێنـان لەسەر چەند کردەیەکی دیاریکراو کارەکـە ئـەنجام دەدات. هـەر لـەم ڕووەوەیـە ناکرێـت (التربیـة و الترویض) هاوشان دابنرێن، چونکە لە پرۆسەی پەروەردەییدا فێرخواز ویست و ئارەزوومەنـدی خـۆی پارێزراوەو ئاگایی ئامادەگی هەیەو پەروەردە ئاراستەی (بوون-کیـان)ی فێرخوازەکـە دەکرێـت و لـە

وشەی ( education)ی ئینگلیزی و فەرەنسی لە بنەڕەتدا (educere)، یا(educare) ی لاتینیە لە سەرەتادا (١٥٢٧ ز) پاشکۆی وشەی خواردن بووە، ئاماژە بە خۆراک و پەروەردەکردنی ئاژەڵ و ڕووەک، هەروەها بە ڕەوشتجوانی دەکرد، بێ جیاکردنەوەیەکی ڕوون و ئاشکرا. تەنانەت تا ساڵی (١٦٤٩ز) لە فەرەنسا وشەی پەروەردە پێکهێنانی دەروون و جەستەی دەگرتەوە. پاشان لە سایەی کلتوری مرۆڤایەتی و پێشکەوتنی زانستی و بەرەوپێشچوونی هزری مرۆڤایەتیەوە لە سەردەمی ڕێنێسانسدا مانا زمانەوانیەکەی ڕووندەکرێتەوە .

---

ناوەوە دەبزوێنێت، ئەمانەش لە خۆیاندا ئاماژەن بە گۆڕینی دەرەکیانەی هەڵسوکەوت و تواناکانی جەستەیی خرۆشان و پێکهاتەیی کە بەهۆیانەوە فێرخواز لە پەرسەندنێکی بەردەوامدایە.

بەڵام جیاوازی نێوان (التربية)و (الطبع و التطبع ) لەوەدایە -هەرچەند لە هەندێك ڕوودا لێك دەچن و ڕۆڵەکانیان ئاڵوگۆڕ دەکەن-، گەر مرۆڤێك لەڕێی بۆماوەییەوە خوویەك، سروشتێك، مۆرکێکی تایبەتی وەرگرتبێت، ئەوا لە پرۆسەی پەروەردەییدا دەکرێتە گونجاندن و ڕێککەوتنێك، وە هاوسەنگیەك دروست دەبێت، بەمەش (التطبع) جۆرێکە لە پەروەردە کە بە ئاوێتەبوونێکی چالاکانە تاکە کەس ئاوێتە بە کۆمەڵگا دەکات و شوناسی کلتوریی پێدەبەخشێت. کەواتە یەکێکە لە ڕووخسارەکانی پەروەردە هەندێ جاریش دەتوانێت جێگرەوەی پەروەردە بێت، بەڵام ناتوانێت هەموو ڕۆڵەکانی پەروەردە ببینێت، کەواتە پەروەردە لە مۆرکوەرگرتن (التطبع) گشتگیرترە .

وشەی (التهجين) لە میسرو ئەردەندا بە (التطعيم)یش ناو دەبرێت. ئامانجی ئەم کردارەش بەدەستهێنانی هەندێك خەسڵەت و سروشتی نوێیە، وە لەدەستدانی هەندێکی تر، وەك موتوربەکردنی چڵێك درەختی پرتەقاڵ لەگەڵ درەختێکی لیمۆدا.

بەهەرحاڵ مانای زمانەوانی (المعنی اللغوی) پەروەردە وەك مانا زاراوەییەکەی (المعنی الاصطلاحي) نەبوونەتە سەرچاوەی ئەو لێکنەچوون و ناکۆکیەی پێشتر باسکران، چونکە مانای زاراوەیی ئەم چەمکە بەدرێژایی شارستانیەکان و فەلسەفە جۆراوجۆرەکان هەمیشە گۆڕانی بەسەردا دەهات لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی تر، بگرە تەنانەت لەنێو خودی یەك کۆمەڵگاشدا، بۆیە چەمکی پەروەردە مشتومڕێکی زۆری لێکەوتۆتەوەو پێناسەی جۆراوجۆر هەڵدەگرێت.

بەپێی ئەو شیکردنەوانەی لە سەرەتادا خرانەڕوو دەتوانین بڵێین کارێکی مەترسیدارە گەر پرۆسەی پەروەردە لە خاڵێك، یا چەند خاڵێك لەمانەی خوارەوەدا کۆبکەینەوە:

- فێرکردنی زانست و زانیاریە لە چەند دەزگایەکی تایبەت بەم کارە.
- گەیاندن و پێدانی شێوازەکانی هەڵسوکەوت و بەهاو خوو و نەریتەکانی کۆمەڵگە بێت.
- ڕاهێنانی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگەو ئاوێتەبوونیانە بە ژینگەی کۆمەڵایەتی.
- پەرەدان بە دیوە جیاوازەکانی کەسایەتی مرۆڤ لەڕووی جەستەیی و ژیریی و سۆزداریی کۆمەڵایەتیەوە.
- ئامادەکردنی نەوەکان بێت بۆ بەجێهێنانی ئەرك و پیشەکانیان و دابینکردنی بژێوی.

- ئامادەکردنی نەوەکان بۆ پێکەوەنانی دواڕۆژ.

لە ڕاستیدا ئەو گۆشە نیگایانەی بە خاڵ ڕوونکرانەوە گەر بە تاك، یا چەند خاڵێکیان بە دابڕاوی بسەپێنرێت بەسەر پرۆسەی پەروەردەییدا ئەوا پێناسەی پەروەردە کورت دەهێنێت و بەهیچ جۆرێك گونجاو نابێت بۆ ئەم سەردەمەی ئێستای کۆمەڵگایەك لە دەروازەکانی سەدەی بیست و یەکدا تێدەپەڕێت، بەڵام گەر هەموویان بەسەریەکەوە کۆبکرێنەوەو پێکەوە دیدێك بۆ پرۆسەکە دابڕێژن ئەوا تاك و کۆمەڵ لە یەکەیەکی ڕێك و تەبادا دەگونجێنن، ئەمەش مانای سەرتاسەری و گشتگیری پەروەردە دەگەیەنێت.

پەروەر... بەو جۆرەی باسمان کرد تاکە کەس دەکاتە تەوەرو بابەتی سەرەکی، وە هەموو پێکهاتەی کەسایەتی گەشەپێدەدات لەڕووی ئاراستەکانیو بیرکردنەوەو شارەزایی و لێزانییەکان لە گۆشەنیگای پەیوەندیەکانیەوە بە ڕابردووی کۆمەڵگاوە، تاکە کەس بە هەڵگری کلتوری کۆمەڵگاو درێژەپێدەری ئەم ڕۆشنبیریە دادەنێت، هەروەها ئەم تاکە دەبێتە ئامرازیکی پێکهێنەری ئێستای کۆمەڵگاو دروستکەری بارودۆخە ئابووری و کۆمەڵایەتیو قۆناغەکانی پێشکەوتن.

بەپێی ئەم دیدە سەرتاسەرییە بۆ پەروەردە دەتوانین بڵێین:- پرۆسەیەکی وشیارانەی مەبەستدارە (لە هەمان کاتدا بێ مەبەستە) لەپێناو پەرەسەندن وگۆڕان و گونجاندنێکی بەردەوامی تاکە کەسە لەنێو گۆشە جیاوازەکان و

ڕەهەندی بژاوت و پێکهاتەی کۆمەڵگا، بەپێی ئەو شارەزاییانەی لە ڕابردوودا پێك هاتوون لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی ئێستاو ئەگەرەکانی داهاتوودا، ئەمانە هەموو پێکەوە کاردەکەن بۆ برەودان بە گشت لایەنەکانی کەسایەتی تاکە کەس، هەروەها پێکهێنانێکی کۆمەلایەتیانە لە کات و شوێنی دیاریکراودا بۆ ڕەخساندنی ئاوێتەبوون و کارلێك و هاوسەنگی بەردەوام لەنێوان پێکهاتەی کەسایەتی و ئەو ژینگەیەی تێیدا دەژی، بەو جۆرەی ئەو توانایەی پێ ببەخشێت کە درێژەپێدەری ژیانی کۆمەڵ و بەرەوپێشچوونی بێت، وە بتوانێت ڕۆلی کۆمەلایەتیانەی خۆی بەتەواوی جێبەجێ بکات و هەستێت بە ئەرك و لێپرسراوێتیەکانی.

پەروەردەش بەپێی ئەم ماناو ئاماژانە پرۆسەیەکی تەواو و سەرتاسەرییە تاك و کۆمەڵ لەخۆ دەگرێت و دەیانکاتە بابەتی سەرەکی و کەسایەتی مرۆڤ و ئاراستەیان دەکات بەرەو گەشەپێدانی جەستەیی و ژیری و سۆزداری و کۆمەلایەتی سەرەڕای پێکهێنان و دروستکردنی شارەزایی ولێزانی وپێدانی بەهاو خوونەریت و هەڵسوکەوتی مرۆیانە، بەجۆرێك کە ئەو تاکە بتوانێت تا ئەو پەڕی توانا پەرە بەم لایەنانە بدات و لە چوارچێوەیەکی کۆمەلایەتی چالاکی پەیوەست بە ژیانەوە گرێبدات لە هەموو ڕووە جیاوازەکانی ئابووری و کۆمەلایەتی و ڕامیاری، هەروەها بتوانێت گونجاندنێك دروست بکات لەگەڵ هەلوێستە گۆڕاوەکانی ژیانی ئێستای کۆمەڵ، تاك دەبێتە وەلامدەرەوەی ئەو

ڕۆڵە کۆمەڵایەتیانەی پێی دەدرێت، هەست بە هەڵبژاردنەکانی تاکیتی بەکۆمەڵبوون دەکات، وە ئەو توانایەشی بۆ دەڕەخسێت کە بەپێی خواست و داواکارییەکانی کۆمەڵ کارو چالاکیەکانی ئەنجام بدات. بەمەش پەروەردە دەبێتە پێکهێنەرێکی داهێنەرانەی کەسانی بەتواناو لێهاتوو بۆ خودی خۆیان و کۆمەڵ و ژینگەکەیان.

ئێستاش هەوڵدەدەین جیاکاریەك بکەین لەنێوان هەندێك لەو دەستەواژەو زاراوانەی تێکەڵ بە چەمکی پەروەردە کراون، دەبنە هۆی شێواندن و خراپ بەکارهێنانیان لەلایەن پەروەردەکاران و فێرکاراندا، سودی ئەم جیاکردنەوەیە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە دەمانگەیەنێتە دیاریکردنی ئەو زاراوەو چەمکگەلانەی لە چوارچێوەی پرۆسەی پەروەردا بۆئەوەی بونیادێکی ڕوون و ئاشکرامان هەبێت، هەر وەها دەبنە دەرخەری لایەنە جیاوازو لێکنەچووەکان، لایەنی تەواوکاریمان بۆ ڕوون دەکەنەوە. ئەم دەستەواژەو زاراوانە جگە لە (پەروەردە، فێرکردن، وانەوتنەوە)و ئەو بابەتانەی گرێدراوی چەند چەمکێکی تری پەیوەست بە سیستم و ڕێکخستنەکانی سەردەمەوە هەیە.

لەم پێناسەیەی بۆ پەروەردە کرا ڕوون دەبێتەوە : پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی سەرتاسەرییەو لەنێوەندو دامودەزگا جۆراوجۆرەکاندا ڕوودەدات، هەندێجار جیاکراوەو تایبەتە هەندێ جاری دیکەش تەواو و بێ کەم وکورتیە، بەپێی

بەرەوپێشچوونی پەروەردەو گەشەکردنی ئەم پرۆسەیە دابەشدەکرێت بەسەر دوو جۆردا:

یەکەم: پەروەردەی مەبەستدار (التربیة المقصودة).

دووەم: پەروەردەی بێ مەبەست (التربیه غیر المقصودة).

پەروەردەی بێ مەبەست، یا پەروەردەی دەرەخوێندنگا پێش جۆری یەکەمیان (واتا پەروەردەی مەبەستدار) سەریهەڵداوە، لەگەڵ ئەو بایەخ و گرنگیەی دراوەتە جۆری یەکەم دەبینین تا ئێستاش پەروەردەی بێ مەبەست هەر بەردەوامەو بوونی هەیە، چونکە سەرچاوەیەکی سەرەکی پێکهاتەکانی کەسایەتی و لێزانی و شارەزایی و ئاراستەکانی مرۆڤە، وە بەدرێژایی ژیانی تاکە کەس پێبەپێی مرۆڤەکان ئامادەیی هەیە، هەرچەندە ئەو کەسە پلەیەکی خوێندنی بالای لە جۆری پەروەردەی بەمەبەستی بەدەستهێنابێت .

پەروەردەی بێ مەبەست پرۆسەیەکی بەردەوامە بەدرێژایی تەمەنی مرۆڤەکان لەنێو کۆمەڵگاو ژینگەی سروشتیدا دەردەخسێت و شێوازێکی خۆبەخۆیی (تلقائی) هەیە، لەرووی چۆنیەتیەوە بەهەمان جۆری پەروەردەی مەبەستدار روودەدات، بەڵام پەروەردەی بێ مەبەست رێکخستن و پرۆگرامی خوێندنی دیاریکراوی نیە، هەروەها بەبێ بوونی دەسەڵات و پەروەردەکاران، وە لەرێی هەردوو پرۆسەی فێرکردن و فێربوونی بێ مەبەستانە ئەنجام دەدرێت، چونکە تاکە کەس هەر لە سەرەتای لەدایکبوونیەوە بە چەندین ئەزموونی فێربوون و

هەڵوێست و ڕووداو و کەس و شتەکاندا تێدەپەڕێت و کارلێکیان لەگەڵ دەکات، هەر لەڕێی ئەمانەوە جۆرەها زانیاری و ئاڕاستەی بیرکردنەوەو بەهاو شارەزایی وەردەگرێت، سەرچاوەکانی فێربوون لەم شێوازە پەروەردەییەدا وەك: خێزان، هاوڕێیان، ڕاگەیاندنەکان، یانە وەرزشی و ڕۆشنبیریەکان، شوێنی کارو کات بەسەربردنەکان، نێو شەقام و بازاڕەکان، ژینگەی سروشتی... هتد، بۆ نموونە منداڵ سرودی نیشتمانی و چیرۆك و پەندو ئامۆژگاریەکان بەهۆی چەند بارەبوونەوە یان فێر دەبێت، یاخود کچان لە دایکیانەوە فێری چێشت لێنان دەبن، وە کوڕانیش شارەزاییەکانیان لە باوك و هاوڕێ وەردەگرن.

تاکە کەس بەهۆی گوزەرانی لەنێو ئەو زنجیرە پەیوەندییە کۆمەڵایەتیەو تێکەڵبوونی بە ژینگەکانی وەك: خێزان، یا بازاڕو شەقام، یاخود مزگەوت... مانای ئازادی و جۆری پاداشت و سزاکان و بەها پەسەندو قێزەونەکان و هاوڕێیەتی و ماف و ئەرك و چەندین شتگەلی دیکەش فێر دەبێت و بەپێکەوەنانیان کەسایەتی خۆی دادەڕێژێت و هەست و سۆزو خوو نەریتەکان بونیاد دەنێت .

کەواتە پەروەردە بەم مانایەی فراوانی و پانتاییەکی بەرینتر لە پێگەیاندن و پەروەردەی کۆمەڵایەتی، یاخود مۆرکوەرگرتن (کە پێشتر ئاماژەی پێدرابوو) لەخۆ دەگرێت.

جۆری دووەم کە پەروەردەی مەبەستدار، یا خوێندنگایی، ئەمیش پرۆسەی فێربوون و پەروەردەکردن دەگرێتەوە کە لەنێو قوتابخانە و دامودەزگای سیستمی فێرکاریدا ئەنجام دەدرێت، بەپێی ڕێکخستن و دەسەڵاتێکی فەرمیانە (رسمیة) لەگەڵ هەبوونی ئامانجی دیاریکراو و بەرنامەو پرۆگرامی پێشتر ئامادەکراو لەژێر چاودێری پەروەردەکاری شارەزاو سەرپەرشتیاری پسپۆڕ. ئامانجیش لەم پرۆسەیە پەرەدان و گەشەسەندنی ڕۆڵەکانی میللەتە لەڕووی جەستەیی و ژیری و سۆزداری و برەودان بە ڕەهەندە جیاوازەکانی کۆمەڵگەو شوناسی کلتوری، سەرەڕای پێدانی زانیاری و پیشەو ئاڕاستەکانی بیرکردنەوە.

بەوپێیەی پەروەردەی مەبەستدار لەنێو خوێندنگاکاندا بەڕێوە دەچێت، کەواتە بەرهەمی هەردوو پرۆسەی (فێرکردن و فێربوونە— التعليم و التعلم)، ئامرازی فێرکردن وانەوتنەوەیەو ئامرازی فێربوونیش ئامادەیی و چالاکی فێرخوازە، لۆژیکیانەش دەتوانین بڵێین دەرەنجامی فێرکردن فێربوونەو دوا بەرهەمی فێربوونیش پەروەردەیە.

گەر فێکردن بریتی بێت لە گەیاندنی زانیاری و زانین و شارەزایی و ڕاستیەکان لە فێرکارەوە بۆ فێرخواز ئەوا فێرکردن هەوڵێکە مامۆستا پێی هەڵدەستێت بۆ یارمەتیدانی کەسێکی تر بۆ فێربوون .

واتا مامۆستا بەهۆی پرۆگرامێکی خوێندن و وانەوتنەوەو چەندین چالاکی دیکەی ناوپۆلی و دەرەپۆلی (ألانشطة الصفيتو اللاصفية) کارەکەی ئەنجام

دەدات، بەو مەبەستەی هانی فێرخواز بدات و توانا شاراوەو ئاشکراکانی ببزوێنێت، وە ئامادەکاری دۆخێك دەكات خوێندکار تێیدا توانای فێربوونی هەبێت، لێرەوە دەڵێین پرۆسەی فێرکردن ناوەڕۆکێکی پەروەردانەی هەیە بەپێی ئەو بنەمایەی کە زانست و زانیاری و ڕاستییە پێشکەشکراوەکان بە خوێندکار چەندین لایەنی جێبەجێکردن و پراکتیزەکردنیان هەیە، گەر ئەمانەش بدرێنە فێرخواز ئەوا دەگاتە ئەو ئاستەی لە ژیانی خۆیدا بەشێوەیەکی پراکتیکیانە پیادەیان بکات، کەواتە دەتوانین بڵێین کە ئەم فێرخوازە کاردەکات، ئاڕاستەکان وەردەگرێت، چونکە دەزانێت (واتا زانیاری وەرگرتوە).

هەر زیادبوونێکی چەندایەتی لە زانیاری و شارەزاییە نوێکاندا،پاشان تێکەڵبکرێن بەوانی پێشتر وەرگیراون، ئەوا دەبێتە گۆڕانێکی چۆنایەتی، یاخود دەبنە گۆڕینی پراکتیزەکردن و نواندن، شێوازێکی نوێش دەداتە بیرکردنەوە. کەواتە فێربوون هەر تەنها ئەوەندە نیە کە تاکە کەس فێری کۆمەڵێك زانیاری شارەزایی بکرێت، گەر بەمجۆرە بێت ئەوا هیچ جیاوازییەکی لەگەڵ ڕیکۆردەر، یا ئامێرێکی ژماردندا نابێت، بەڵام فێربوونی نوێ و شارەزایی باش و کۆکردنەوە یان لەگەڵ ئەو زانیاریانەی پێشتر وەریگرتون ئەو دەرەنجامەی دەبێت تاك: هەڵسوکەوت، کار، هەستکردن، بیرکردنەوەی باشتر بەئەنجام بگەیەنێت کە ئەمەش لایەنی پەروەردەییە لە فێربووندا.

کەواتە فێربوون لای فێرخواز چالاکیەکی خودیە بە یارمەتی و هاوکاری مامۆستاو ڕێنیشاندانی لە خودی فێرخوازدا دەڕەخسێت، سەرکەوتنی پرۆسەی فێربوون لە دەستەبەرکردنی مەرجی بابەتی وخودییەوە سەرچاوە دەگرێت کە مامۆستا فەراهەمی دەکات.

بەپێی ئەوانەی باسکران دەتوانین بڵێین: ئەو فێرکردنەی هەلگری ناوەڕۆکێکی پەروەردەییانەیە، هۆ و دەرەنجامی پرۆسەی فێربوون بووە لە هەمان کاتدا، وە دەرەنجامی فێرکردن و فێربوونیش پەروەردەیە، بەهەمان دەرەنجام دەڵێین: ئەرکی خوێندنگا پەروەردەکردنە بەو پێیەی کە فێربوون و فێرکردن ئەرك و کاری خوێندنگایە، گەر ئەم دوو پرۆسەیە لە ناوەوەو دەرەوەی خوێندنگا بەوە ئەنجام بگەیەنرێن نەك تەنها لەنێو پۆلەکاندا، وە خوێندنگاش سیستمێکی کۆمەڵایەتی بێت کەواتە کارو بنەمای بوونی ئەم دەزگایە پەروەردەکردنە.

ئەم هێلکاریەی خوارەوە دەرخەری هەردوو جۆرەکی پەروەردەیە.

نەخشەی (١) دوو جۆرەکەی پەروەردەو پێکهاتەکەیان.

پەروەردە

بەمانە دێتەدی:-
- ڕێکخستن
- دەسەڵات
- ئامانج
- پرۆگرام
- مامۆستایان

پەروەردەی

فێرکردن ← خوێندگا → فێربوون

مامۆستایان
پرۆگرامێکی بە:-
ئامانج
ناوەڕۆك
چالاکی
هەڵسەنگاندن

فێرخوازان:-
پاڵنەرەکان
ئامانج
بابەتی ئاسان و ئاشکرا
چالاکی خودی
کۆنگرتن لە خۆ
زانینێك کە فێرخواز بەرەوپێشیبەرێت

زانیارییەکان
ئاراستەکان
شارەزاییەکان

بەمانە دێتەدی:-
خۆبەسەری، بەبێ:
ئامانجی پێشتر دیاریکراو
دەسەڵاتی پێشتر دیاریکراو
پرۆگرامی پێشتر دیاریکراو
مامۆستایانی پسپۆڕ

پەروەردەی بێ مەبەست

فێرکردن — فێربوون

خێزان
کەسە نزیکەکان
مزگەوت
ڕاگەیاندن
یانەکان
ڕێکخراوە
پیشەییەکان
پارتە سیاسیەکان
ژینگەی سروشتی

تێکەڵبوون
لاسایکردنەوە
چاولێکردن
بە نموونە
وەرگرتن
شارەزایی

پەروەردە + پێگەیاندن = پەروەردە

پەروەردە = پێگەیاندن + پەروەردە

نەخشەی ژمارە (١) ڕوونکردنەوەی هەردوو جۆرەکەی پەروەردە

بەهۆی ڕۆڵ و کارایی پەروەردەی مەبەستدارەوە چەندین جۆرو شێوازی تـوێـی فێرکردن و فێربوون داهێنراون و پەرەیان پێدراوە کـە بـە فێرکردنـی نافـەرمی (لانظامي، غیر رسمي) ناسراون، وە ژمارەیەك شـێوازی فێرکردنـی پێـشکەوتوو لەخۆ دەگرن و تێپەڕاندنی شێوازە باوەکانی خوێندنی فـەرمی (نظـامي، رسمـی) بوون، ئەمانەش بـەرەو نەهێـشتنی نەخوێنـدەواری و فێرکردنـی بەتەمەنـەکان ئاڕاستەکران.

سیستمی پەروەردەی خوێندنگایی لـە فێرکردنـی فـەرمی و فێرکردنـی نـا فەرمی پێکدێت وەك لەم خشتەیەی لای خوارەوە ڕوونکراوەتەوە:

## نەخشەی ژمارە (٢)

## خوێندنی مەبستدار (خوێندنگایی)

































## دووەم – گرنگی و بایەخی پەروەردە لە سەردەمی ئێستادا

هەر کەم و کوڕییەك لە ئەرکەکانی پەروەردەدا دەبنە هۆی سەرهەڵدانی کۆسپ و بەربەست لەسەر ڕێی بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگە بەو جۆرەی نەتوانێت شان بەشانی پێشکەوتنەکان هەنگاو بنێت.

بایەخ و گرنگی بواری پەروەردە لە سەردەمی زانست و تەکنەلۆجیاو شۆڕشی زانیارییەکان و ئەلکترۆنیات چەند بەرابەر زیاد دەکات، چونکە پەروەردە هۆکارو ئامرازی بنەڕەتی و سەرەکی ئەو پێشکەوتنانە دەبێت کە لە کۆمەڵگا ڕوو دەدەن، بەڵگەش لەسەر ئەم ڕاستییە هەر وڵاتێکی پێشکەوتوو و بەهێز لەڕووی سەربازی، ئابووری، تەکنەلۆجیدا لەپشت ئەم پێشکەوتن و بەهێزییەدا پەروەردەیەکی تۆکمەو پتەو ئامادەیی هەیە کە ئەو پێگە بەهێزەی پێدەبەخشێت لەنێو شارستانییە سەردەمییەکاندا. لەبەر ئەم هۆیە وڵاتان لە پێشبڕکێی ئەوەدان پەروەردە لە کۆت و بەندەکان ڕەها بکەن و بەجۆرێك بەرەو پێشی ببەن کە بکرێتە هێزێکی وەڵامدەرەوە بۆ خواست و پێداویستییەکانیان لەم سەردەمە هەوڵدانێك بێت بۆ باشکردنی دوارۆژو هەنگاو بەرەو داهاتوو.

بەشێوەیەکی گشتی ئەم شیکردنەوەیەی خوارەوە بایەخی ڕوو لە زیادی پەروەردە لە هەر کۆمەڵگایەکدا دەخاتەڕوو، ئەویش لەڕێی ئەم هۆکارانەوە:

١-پەروەردە ئامرازی مانەوەو بەردەوامی کۆمەڵگەیە.

٢-ئامرازێکە بۆ بەردەوامبوونی کلتوری کۆمەڵگا لەڕێی: پاراستن، گواستنەوە، نوێکردنەوەی ئەو کلتورە.

٣-پەرەو گەشەی سەرتاسەری ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە دێنێتە دی.

٤- بۆ بونیادنانی کۆمەڵ و دەوڵەتی نوێ.

٥-بۆ هێنانەدی دیموکراسی.

٦-بۆ هێنانەدی بەرەوپێشچوون.

٧-بۆ پێکهوەنانی داهاتوو.

ئێستاش هەر یەك لەو خاڵانە ڕووندەکەینەوە:

**١- پەروەردە ئامرازی بەردەوامبوون و مانەوەی کۆمەڵگەیە:**

مانەوەو بەردەوامبوونی هەر کۆمەڵگەیەك پشت دەبەستێت بە بەردەوامبوونی ژیانی تاکەکانی ئەو کۆمەڵگەیە لەڕووی بایۆلۆجی و کۆمەڵایەتی و..... هتد. پەروەردەش ئامرازو بەدیهێنەری ئەم پرۆسەیەیە، چونکە گەر تاکە کەس بنەماو پێکهێنەری کۆمەڵگا بێت ئەواپەروەردە ئەو کەسە لە بوونەوەرێکی بایۆلۆجیەوە دەگۆڕێت بۆ بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتی و ئاوێتەی کلتوری کۆمەڵایەتی دەکات.

هەر پەروەردەشە شێوازەکانی ژیانی کۆمەڵگاو کلتورەکەی دیاری دەکات، ئەمیش لەڕێی چاندنی خوو نەریت و ئاراستە جیاوازەکان لە ناخی تاکەکاندا.

مرۆڤ لە بنەڕەتدا بوونەوەرێکی کۆمەڵایەتییە، سروشتی مرۆڤایەتیش دەرناکەوێت گەر لە نێوەندێکی کۆمەڵایەتیدا ژیان بەسەر نەبات. لەپێناو بەدەستهێنانی ئەم خەسڵەتە مرۆڤ هەر لە ساتی لەدایکبوونەوە ئەو نێوەندەی تێدا ژیان دەگوزەرێنێت ئاڕاستەو بۆچوون و زانیاریەکانی پێدەبەخشێت. هۆکاری ئەم وەرگرتنەش پەروەردەیە. کەواتە پەروەردە بەپێی ئەو دراوەی سەرەوە ئامرازی پەراندنەوەی مرۆڤە لە دۆخی تاکە کەسێتی پەتیەوە بۆ مرۆڤبوونی ڕاستەقینە.

بەو جۆرەی هەست بە بوونی (پابەندبوون- ئینتیما) بۆ کۆمەڵگە بکات و هەڵگری خەسڵەت و کلتورەکانی بێت. وەڵامدەرەوەی ئەو ڕۆڵ و هەڵوێستە شیاوانە بێت کە کۆمەڵگا چاوەڕوانی لێ دەکات .

لێرەوە بۆمان دەردەکەوێت گەر پەروەردە بەدیهێنەری ئاوێتەبوونی تاک بە کۆمەڵگە بێت، ئەوا دەشبێتە ئامرازێکی کۆمەڵگە، کە خۆی لەنێو هەڵسوکەوتی تاکەکانیەوە بنوێنێت. بەجۆرە ژیانی کۆمەڵگە بەردەوام دەبێ و پێکهاتەکانی دیاری دەکرێن.

**٢- پەروەردە ئامرازی بەردەوامبوونی کلتوری کۆمەڵگەیە لەڕێی ( پاراستن، گواستنەوە، نوێکردنەوەی ئەو کلتورە ):**

هەر کۆمەڵگەیەك کلتورێکی جیاکەرەوەی هەیە کە تایبەتمەندێتی پێدەبەخشێت، ئەم کلتورەش بەدرێژایی مێژوو پێکەوەنراوە نەوە لە دوای نەوە پارێزگارییان لێکردوە. کلتوریش دەرەنجامی ئاوێتەبوونی تاکەکانە لەگەڵ ژینگەو

ڕۆشنبیری و کۆمەڵگاکانی دیکە، هەموو کۆمەڵگایەك هەوڵدەدات نەوەکانی لەسەر ئەم کلتورە پێبگەیەنێت و بیانکاتە هەڵگری شێوازی تایبەت کە ئەم کارەش لە ڕێگەی پەروەردەوە ئەنجام دەدرێت، لەم ڕووەوە پەروەردە هەڵدەستێت بە:

- پاراستنی کلتوری ڕۆشنبیری، چونکە پەروەردە لانەی سروشتی زانین و شارەزاییە ئاڵۆزەکانی ژیانە.
- گەیاندنی کلتوری ڕۆشنبیری بە نەوە تازەکان بەهۆی ئەو ئامانج و پرۆگرام و شێوازو پسپۆڕێتییەی لە پرۆسەی پەروەردەدا هەن .
- پاکژکردنەوەو پاڵاوتنی کلتوری ڕۆشنبیری، چونکە پەروەردە هەمیشە چاوێکی پشکنەرە بۆ پێداچوونەوەیەکی بەردەوام تا ڕێگرو کۆسپەکانی قۆناغی پێشکەوتن لەناوبەرێت.
- نوێکردنەوەی کلتوری ڕۆشنبیری، چونکە ئەم پرۆسەیە کاردەکات لەپێناو گۆڕین و چاکترکردنی شارەزایی و زانیاری و شێوازەکانی کار، سەرەڕای گەشەپێدانی تواناو جۆری بیرکردنەوەی تاکە کەس تا بتوانێت خستنەسەرو تازەگەری ئەنجام بدات.

### ٣- بۆهێنانەدی پەرسەندنێکی سەرتاسەریانەی ڕۆڵەکانی کۆمەڵگە:

کاری ئێستای پەروەردە هەر تەنها ئەوەندە نیە کە (دەستەبژێرێك- نخبة)ی تایبەتمەند لەڕووی ژیری و زانیارییەوە ئامادە بکات، بەڵکو لە دیدێکی سەرتاسەری هەمە لایەنەوە پەرە بە تواناو ئامادەییەکانی هەموو تاکێکی

کۆمەڵ دەدات، ئەمەش گشت لایەنەکانی کەسایەتی دەگرێتەوە وەك: ژیریی، جەستەیی، زانین، دەروونی، ئاکاریی (أخلاقی) سەرەڕای: شارەزایی و ئاڕاستەو بەها جۆراوجۆرەکانی کەسایەتی. هەروەها بەرەو گونجاندنیان دەبات لەگەڵ ژینگە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکان بەجۆرێك لە توانایاندا بێت ئەرکی سەرشانیان جێبەجێ بکەن، واتا ئامادەیان دەکات بۆ ئەرکە مەزنەکە (ئەویش ژیانە) بە هەموو بارو ڕەهەندە جیاوازەکانیەوە.

پەروەردەی ئەم سەردەمە چەندین تەکنیك و بەرنامەو پرۆگرامی تازەی بەدەستهێناوە، ئەمیش بەهۆی پێشکەوتنەکانی بواری زانستی دەروونی و کارگێڕی و بەڕێوەبردن و زانستە کۆمەڵایەتییەکان و... هتد. سەرەڕای دەرکەوتنی گەلێك سیستم و شێوازی نوێی فێربوون و فێرکردن (التعلم و التعلیم)، ئەمانیش بوونەتە هۆکاری ڕەخساندنی هەلی پەرەپێدانی تواناکان و پەروەردە بۆ ژمارەیەکی زۆر لە تاکەکانی کۆمەڵ بۆ گەیشتن بەو شوێن و پلەوپایەیەی خۆیان دەیخوازن. پەرسەندن و گەشەکردنی تاکەکانی کۆمەڵ بریتیە لە ئامانجی هەرەباڵای پەروەردە.

## ٤- بونیادنانی کۆمەڵگەو دەوڵەتی نوێ:

تەنها سەروەت و سەرچاوەکانی ئابووری نابنە هۆی بونیادنانی کۆمەڵگە، بەڵکو جگە لەمانە بە توانای مرۆیی ئامادەو لێهاتوو، و وەبەرهێنانی نموونەیی ئەم کارە مەیسەر دەبێت، چونکە سەروەت و سەرچاوە سروشتی و ئابوورییەکان

پێویستیان بەو بنەما مرۆییە سازو ئامادەیە هەیە کە بتوانێت بە باشترین شێواز وەبەریان بهێنێت و بیانخاتەگەڕ تا ببنە مایەی سودو قازانجی هەمووان، هەروەها پشت دەبەسترێت بە توانای جەستەیی و ژیری ئەو مرۆڤانەو دەسەڵاتی داهێنەرانەیان بۆ زاڵبوون بەسەر کەمی، یاخود نەبوونی ئەو سەرچاوە سروشتیانە بەڵگەشمان بۆ ڕاستی ئەم مەسەلەیە دوو وڵاتی وەك یابان و سویدە.

لە ئێستادا کایەی پەروەردە بۆتە گۆڕەپانی پێشبڕکێی نێوان دەوڵەتان تا بیکەنە پەیامی سەرکەتن و بەهێزییان لەڕووی پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونیاندا. هەر دەوڵەتێك پشت دەبەستێت بە پەرەدان بە ڕۆڵەکانی میللەت بۆئەوەی متمانەیەکی لەو جۆرەیان تێدا بڕەخسێت بکرێنە بەردی بناغەی هەموو پێشکەوتنێك و سەرچاوەی هێزی دەوڵەتەکەیان، چونکە هەموو پێشکەوتنێك بەندە لەسەر توانای ژیریی و لێهاتوویی هاوڵاتیانی دەوڵەتەکە، وە ئەم بنەمایەش لەڕێی پەروەردەوە دەستەبەر دەکرێت. دەبێت ئەوە بزانین کە لەپشت هەر وڵاتێکی بەهێزو پێشکەوتووەوە سیستمێکی پەروەردەییانەی بەهێزو پێشکەوتوو هەیە، بۆ نموونە وڵاتی یابان مەزنی نیشتمانی (العظمة الوطنية)ی کردۆتە ئامانجی هەرە باڵای پرۆسەی پەروەردەیی، بەدڵنیاییەوە دەڵێین ئەو ڕاستیدا ڕێنیسانس و بوژانەوەی هەر کۆمەڵگەیەك بەندە لەسەر بوونی دەوڵەتێکی نوێ، کە ئەم دەوڵەتە ئامادەسازی بۆ مەرجەکانی ئەو بوژانەوەیە

دەکات و پاڵپشتی لە بەردەوامبوونی دەکات، لەپاشاندا دەوڵەتی نوێ بنەمای هێزو پێکهاتەی بونیادنانی لەم بوژاندنەوەیە پێکەوە دەنێت، پەروەردەش ئامرازی بەدیهێنەری ئەم کارەیە، لەرێی پەروەردەوە دەوڵەت دەتوانێت بنەماکانی بوون و هێزی خۆی دەستەبەر بکات بە پێگەیاندنی کادری پسپۆڕو لێهاتوو و هێزی داهێنەرانەو شێوازی نوێگەری و چاندنی ڕۆحی لایەنگری و پابەندبوون و خۆشەویستی نیشتمان، یاخود بەشێوازێك لە نەوەکاندا هەستی نیشتمانپەروەری و پاڵپشتکردن لە سیستمی فەرمانڕەوایی پەرە پێبدات لە بیرکردنەوەو ئاراستەی هەڵسوکەوت و بۆچوونەکانیان تا ئەو ڕەنگدانەوە یان هەبێت پێکهاتەی هەستی نەتەوەیی و یەکڕیزی کۆمەلایەتی بەهێزو پتەو بکەن.

هەر دەوڵەتێك دەتوانێت لەرێی پەروەردەوە ئەم کارانە بە ئەنجام بگەیەنێت:-

- پێگەیاندنی ئەو نەوەیەی کە باوەڕیان بەو سیستمی سیاسی و فەرمانڕەواییە هەبێت و ئامادەی بەرگریکردن و لایەنگیری تەواوی دەکەن.
- برەودان بە بەهای خۆشەویستی نیشتمان و نەتەوەیی.
- کەمکردنەوەی جیاوازی و دژایەتیەکانی لەنێوان نەوەیەکدا.
- نەریتی بەشداریکردن لە هەڵبژاردنەکانیان پێ دەبەخشێت و لایەنگری بەرنامەو پرۆژەکانی دەوڵەت دەکەن.
- چاندنی گیانی بەشداریکردنی دیموکراسیانەو پیادەکردنی لە ژیانی گشتیدا، ئەویش لەرێی ئەو کەنالانەی دەوڵەت دایاندەنێت.

### ٥- پەروەردە بۆ هێنانەدی دیموکراسیەت:-

پەروەردە لە ڕێی سیستم و دامودەزگاو پرۆسەکانی فێرکردن و فێربوونەوە کار لەسەر ئەو بنەمایانە دەکات کە هەر دەوڵەتێك لەپێناو ئازادی و دادپەروەری و یەکسانی و هاوبەرپرسیارێتی کۆمەڵایەتی بەرنامەڕێژی بۆ دەکات . وە هەوڵدەدات بیانکاتە راستیەکی پراکتیکیانە و هەڵسوکەوتێك کە رۆژانە پەیڕەو بکرێت بۆ چاوپۆشین لە رادەو ئاستی جێبەجێکردنیان.بنەمای دیموکراسی بوونی فێرکردن و رەخساندنی هەڵەکانی فێرکاری بێ هیچ جیاوازیەك مانایەکی نییە جگە لەپیادەبوون و پراکتیزەکردنێکی راستەقینەی ماناکانی تاکەکەس،واتا ئەو یاساو دەستورەی چەسپاندویانەو بڕیاریان لەسەرداوە.

پەروەردەش لەم ڕووانەوە ئەم پرۆسەیە بەدی دێنێت:-

١-هەموو تاکێکی کۆمەڵگە ئەو مافەی هەبێت کە لە سیستمی پەروەردەیی دا قبوڵ بکرێت وبگاتە ئەو ئاستەی کە خۆی دەیخوازێت بێ هیچ جیاوازیەك، هەروەها رەخساندنی هەلی لەبارو گونجاو بۆ هەموو توێژە جیاوازەکانی کومەڵ بەپێی بارودۆخی تایبەت بەخۆیان ، ئەمەش لەخۆیدا مانای پراکتیکی بە دیموکراسیەتبوونی بوونی فێرکردن دەگەیەنیت.

٢-گەیاندنی چەمك و بەهاو شێوازەکانی دیموکراسیەت بە رۆڵەکانی کۆمەڵگە لە نێوەندەکانی خوێندن یاخود لەرێی مامەڵەکردن و هەڵسەنگاندنیان.

٣-سڕینەوەی جیاوازییە چینایەتی و کۆمەڵایەتیەکانی نێو تاکەکانی کۆمەڵ و هەوڵدان بۆ نەهێشتن و بەرتەسک کردنیان بەپێی توانا.

٤-فێرکردنی بنەماکانی ڕێزگرتن و پابەندبوون بە ئازادیەکانی کەسانی تروە سەرەڕای گەیاندنی بەهای یەکسانی و دادپەروەری.

٥-چاندنی بەها گەلی دیموکراسیەت و پەیڕەوی کردنی لەژیانی ڕۆژانەدا لەڕێی کەناڵە جیاوازەکانی دەولەتەوە.

**٦- پەروەردە بۆ هێنانەدی بەرەو پێشچوون :-**

لەبەرئەوەی پەروەردە کاریگەرترین ئامرازی کۆمەلایەتی و هۆکاری پێشکەوتنی پیشەسازییە، بۆیە بە باشترین هۆی دووبارە بونیادنانەوەی کۆمەڵ و گونجاوترین بەدیهێنەری ئەو گۆڕانکاریانە دەبێت کە کۆمەڵگە دەیانخوازێت.

بەو پێیەی پەروەردە دروستکەری مرۆڤەو مرۆڤیش بەدیهێنەری پێشکەوتن و بەرەوپێشچوونە، کەواتە پێشکەوتن لە ژیری و فیکرەوە دەسپێدەکات، پاشان بەرەو پراکتیزەکردن هەنگاو بنێت، ئەوا پێویستە ئەم پێشکەوتنە لە ئەقڵ و ژیری ڕۆڵەکانی کۆمەڵگادا بچەسپێنرێت، چونکە بەدیهێنەری هەموو پێشکەوتنێک هەر ئەوان دەبن. بەم دەرەنجامە دەتوانین بڵێین پەروەردە دروستکەرو ڕەخسێنەری ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنەیە.

پێشکەوتنی نوێ و سەردەمیانە پێویستی بە زانست و تەکنەلۆژیایە. وە پشتدەبەستێت بە سوپایەک کادرو شارەزاو لێهاتووی بوارە پسپۆڕییەکان لە

هەموو ئاستەکاندا، هەر پەروەردەش زامن و داینەکەری ئەم خواستەیە،چونکە پرۆسەیەکی پەروەردەیی بەخشندەو ڕێکخراو لەتوانایدایە بە شارەزایی و لێهاتوویی و زانستی جۆربەجۆر سوپایەکی مرۆیی لەو جۆرە پێبگەیەنێت تا پێداویستیەکانی پێشکەوتنی سەردەم بەدەست بهێنێت.

گەر بمانەوێت ڕۆڵی پەروەردە لەڕووی بەدیهێنانی پێشکەوتنەوە بە چەند خاڵێك کورت بکەینەوە، ئەوا بریتین لە:

- ئامادەکردنی پێکهاتەی مرۆیی (العنصر البشری) وەك گرنگترین بنەمای گەشەسەندن و بەرەوپێشچوون، چونکە شارەزایی و لێهاتوویی هێزی کار (کە مرۆڤەکانن) پێویستی هەرەسەرەکی ئەو ئامادەکردنەن لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە.

- بەرەوپێشبردن و پەرەدان بە شێوازو ئامرازەکانی کارو بەرهەمهێنان. پەیمانگا زانستیەکانیش کێڵگەیەکی بەرهەمهێنانی فیکرو تیۆرو ئەزموون و شێوازە نوێکانن.

- دۆزینەوەو دیاریکردنی کۆسپ و بەربەستەکانی ڕێگەی پێشکەوتن، پەروەردەش لەڕێی ئەوپرۆسانەی لەسەر تاکە کەس پیادە دەکرێن و پاشان لەڕێی دەرەنجامەکانی ئەم پرۆسانە لەسەر کۆمەڵ هەوڵدەدات بەسەر ئەو کۆسپ و بەربەستانە سەربکەوێت.

- دۆزینەوەو دەرخستنی توانای لێهاتویی و داهێنەرانە، پاشان ئاڕاستەکردنیان ڕووەو کارو بەرهەم و پیشەی جۆراوجۆر.
- پێکەوەنانی وشیارییەکی گشتی و هەمەلایەنە بۆ بەشداریکردن لە هەوڵەکانی بەرەوپێشچوون یا لایەنی کەم قبوولکردنی ئەو هەوڵ و ئامانجانە.
- پەرەدان بە وشیاری ئابوورییانە، وەك ڕێزگرتن لە بەهاکانی کارو باش بەکاربردن (حسن الاستهلاك).

**٧- پەروەردە بۆ پێکەوەنانی دواڕۆژ:**

دواڕۆژ ناوەڕۆکی پرۆسەی پەروەردەییە، چونکە لەو کاتەی ئێمە فێرخوازێك پێدەگەیەنین هێزو تواناو شارەزاییەکانی برەو پێدەدەین، ئەوا ئەم کارەمان تەنها لەپێناو دواڕۆژدایە. لای هەمووان ئاشکرایە واقعی ئێستا بەهیچ جۆرێك ناکاتە سبەینێ، پەروەردەش لەتوانایدا نابێت دواڕۆژ دروستبکات گەر بە ئاسۆیەکی ڕوون و دیاریکردنی سیماکانی و ئەگەرەکانی بەرەو ڕووی ئەو دواڕۆژە هەنگاو نەنێت، ئەمانەش پشتدەبەستن بە: لێکدانەوە، ڕوونکردنەوە، دیاریکردنی ئێستاو ڕاڤەکردنی وەك ئەزموونێك بەمەبەستی هەوڵدان بۆ پێکەوەنانی داهاتوو.

ژیانی ئێستای کۆمەڵگە هاوچەرخەکان ئەوە دەخەنەڕوو هەمیشە لە گۆڕانێکی خێرا تێژەودان لە بواری زانستی و ڕامیاری و پیشەسازی و... هتد، ئەمەش لەخۆیدا دەرەنجامی پێشکەوتنی زانستی و تەکنەلۆجی و بەرهەمی

داهێنەرانەن کە بوونەتە هۆی گۆڕینی ڕیشەیی لە هەموو کایەکانی ژیاندا، ئەو توانایەش دەبەخشنە ئادەمیزاد ئاڕاستەکەرو فەرمانڕەوایی ئـەو پێشکەوتنانە بکـات و بـەردەوام پـەرەیان پێبـدات. گـرنگترین هۆکـارو ڕەخـسێنەری ئـەم دەسکەوتانەش پرۆسەی پەروەردەیە، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانرێت ئەم گۆڕانکاریە خێراو تیژڕەوانە زۆر فراوان و توندتر لـە گۆڕانـەکانی نێـو کایـەی پـەروەردەدا ڕوودەدەن، ئەمەش پەروەردەی خستۆتە هەڵوێستێکی شپرزەو شـێواو کـە ئـەم پرسیارە جەوهەریە دێنێتە پێش؛

**ئایا پەروەردە بەڕێوەبەرو پێشەوایەتی گۆڕانکاریەکان بکات، یاخود بێتە شوێنکەوتەی ئەو گۆڕانکاریانە؟**

بەو پێیەی پـەروەردە ئـامرازی گۆڕانـەو کۆمەڵگـەش بـەهۆی کاریگـەری جۆراوجۆرەوە گۆڕانی خێراو تیژڕەوی بەسەردا دێت، بۆیە پەروەردە ئەو ئەرکـەی دەکەوێتە سەرشان هەمیشەو بـەردەوام لـە نوێکردنـەوەی فـۆرم و نـاوەڕۆك و شێوازەکانی خۆیدا بێت بۆئەوەی بتوانێت پێشەنگی و ڕابەرایەتی گۆڕانکاریەکان بکات و ببێتە ئاڕاستەکەریان. تەنها لەو کاتەدا ئەمە دێتەدی گەر نوێنەرایەتی و هەماهەنگی ئێستا بکات وچاو ببڕێتە دواڕۆژ و دەستی لە پێکهاتەکانی ئەو داهاتوودا هەبێت، ئەگەر ئەم کارانەش ئەنجام نەدات ئەوا تەنها کاری پەروەردەو ڕۆڵی بریتی دەبێت لە چاکردن و پینەکردن وەك لە زۆربەی وڵاتە دواکەوتووەکاندا بەدی دەکەین.

کۆمەڵگەی نوێ لەم سەردەمەدا لەبەردەم ڕاپەڕین و بوژانەوەیەکی شارستانیدایە کە ئێستا سیماکانی لە دەرکەوتندایە، ئەمیش لە دەرەنجامی ئەو شۆڕشە زانیارییە مەزنەیەو پراکتیزەکردنی تەکنەلۆژیای پێشکەوتوو، وە چاوەڕوانیەکی زۆری ئەوەش دەکرێت گۆڕانکاری مەزن لە بونیادی کۆمەڵگاکان و شێوازی بیرکەوتنەوەو چۆنیەتی ژیاندا فەراهەم بکات. لەبەر ئەمەش وا دەخوازێت کە پەروەردە بەخێرایی خۆی ڕێکبخات. وە پێویستە:-

١. خۆی بەجۆرێك ڕاستبکاتەوە ببێتە هۆکاری یەکلاییکەرەوەی گۆڕانکارییەکان وئاڕاستەکردنیان.

٢. خۆی دەرباز بکات لە شێوازە خوێندنگاییەکەی، ئەو دەزگاو دامەزراوە بەرهەمهێنانە بەکاربەرێت کە شوێنی فێربوونی زانیاری پێویست و بەرهەم و خزمەتگوزارییەکانن، وە ئەو توانایەش ببەخشێتە فێرخواز کە شارەزایی و لێزانی بەکاربهێنێت.

٣. پێگەیاندنی مرۆڤگەلێك توانای بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگەیان هەبێت و گۆڕانکاریەکانیان بەلاوە نامۆ نەبێت.

٤. ئەو گۆڕانکاریانە بکرێنە ئاڕاستەیەکی بەردەوام و پشت بە نەخشەو پلانی سەرتاسەری ببەستن.

٥. لێکۆڵینەوە لەسەر ئەو ئاڕاستە سەرەکیانەی کە بەشدار دەبن لە پێکهێنانی داوارۆژدا.

بەپێی ئەو ڕوونکردنەوانەی پێشتر باسکران ڕۆڵ و بایەخی مەزنی پەروەردەمان بۆ دەردەکەوێت، هەر کۆمەڵگایەکیش ئەم ڕۆڵە پڕ بایەخەی پەروەردە پشتگوێ بخات، یا بیخاتە قۆناغێکی دیکەی گرنگیەکانی دیکەوە، ئەوا بنەمای سەرەکی بوونی خۆی و پێکهاتەکانی یەکڕیزی و بنەڕەتەکانی گەشەکردن لەدەست دەدات، ئەو ڕووە ناتەواو و گرفت و بەرەنگارییانەی لە هەندێ کۆمەڵگادا بەدی دەکرێن تەنها دەرەنجام و ڕەنگدانەوەی لاوازی و سستی و کەم توانایی بواری پرۆسەی پەروەردەیین لەم کۆمەڵگانەدا، هەروەها کورتهێنانی ڕۆڵی ڕاستەقینەی پەروەردەیین.

## سێیەم: ئامانجەکانی پرۆسەی پەروەردەیی:-

ئامانج و ئەرکەکانی پرۆسەی پەروەردەیی جۆراوجۆرن و لە ئاڵۆزبووندان بەتایبەت کاتێک بەوردی سەیری ئەو تێکەڵبوون و تەواوکارییەی نێوان پەروەردەی مەبەستدارو پەروەردەی بێ مەبەست بکەین، چونکە لە ئێستادا خوێندنگا کە دەزگایەکی مەزنی پەروەردەی مەبەستدارە بەو جۆرە نەماوەتەوە کە تەنیا دەزگای پرۆسەی پەروەردەیی بێت، لەبەرئەوەی چەندەها ڕێکخراو و دەزگاو دامەزراوەی تر بەشداری ئەم پرۆسەیە دەکەن (پەروەردەی بێ مەبەست)، وە کاریگەری دیارو بەرچاویان تەنانەت لەسەر خودی خوێندنگاشدا هەیە. بەشێوەیەکی گشتی ئامانجەکانی پرۆسەی پەروەردەیی لە دوو بواردا خۆیان دەبیننەوە کە ئەوانیش تاکە کەس و کۆمەڵگان.

## ١. ئامانجە تاكە كەسیەكانی پەروەردە:-

پەروەردەی نوێ جەخت و پێداگری لەسەر مرۆڤ دەكاتەوە بەو پێیەی مرۆڤ تەوەری سەرەكی و دوا ئامانجی ئەم پرۆسەیەیە، بەجۆرێك پەرەدان بە هەموو لایەنەكانی كەسایەتی بدات وئاسانكاری بۆ پەرەسەندنی تواناو لێهاتووەكانی بكات، وە ئەو شارەزایی و لێهاتووییەی پێ ببەخشێت تا مرۆڤێكی بەتواناو كارامەی لێ دەربچێت و هاوسەنگیە، لەنێوان كەسایەتیەكەی و ژینگە سروشتی و كۆمەلآیەتیەكە دروست بكات. لەپێناو ئامانجی تاكە كەسیدا پەروەردە هەلدەسێت بە چەند ئەرك و چالاكیەك وەك گرنگیپێدانی تاكە كەس لەرێی پێشكەشكردنی خزمەتگوزاری جۆراوجۆرو چاودێریكردنی كۆمەلآیەتی و دەروونیان و هەولدەدات خوێندكاران و فێرخوازان چاو لە نموونە بەرزو بالآكان بكەن بۆئەوەی لەسەر هەلسوكەوتی تەندروست و راست رابهێنرێن. وە فەراهەمكردنی مەرج و پێكهاتە پێویستەكانی پرۆسەی فێركردن لە دانانی پرۆگرام و سەرپەرشتیكردن ونەخشەدانان و هەلسەنگاندن دوا ئامانجەكانی پەروەردە دەهێننە دی.

بەپێی ئەوەی باسكرا پەروەردە لەرووی ئامانجی تاكە كەسیەوە دوا مەبەستی پێگەیاندنی كەسایەتی فێرخوازە لە هەموو لایەنەكانیەوە، ئەمیش بە

پێکەوەنانی کۆمەڵێك شارەزایی و لێزانی و بەهاو ئاراستەی بیرکردنەوەی جیاوازو زانیارییەکان، بوونی ئەم خەسڵەتانە تاکە کەس دەکەن بە:-

- کەسێکی چالاك لەڕووی بیرکردنەوە:- لەڕێی پەرەدان و مەشقکردن بە توانای فیکری فێرخواز وەك :-(تێگەشتن، تێبینینکردن، هەستپێکردن، بیرکردنەوە، لێکدانەوەو شیکردنەوەو ڕاڤەکردن، ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندن، گەشەدان بە توانای ژیریی وهەڵێنجان و بەرەنجام و بەڵگەهێنانەوە ... هتد.
- سۆزدارێتی ڕاست وتەندروست:- ئەمیش بەهۆی پەرەدان بە حەزو ئارەزووەکان وهەست و سۆزوڕاگرتنی هاوسەنگی ورووژێنەرەکان.
- کەسێکی سەرکەوتوو لەڕووی کۆمەڵایەتیەوە:- لەڕێی ئەو زانیارییە کۆمەڵایەتیانەی وەك ڕاوبۆچوونی کۆمەڵ، یاخود خوو نەریتەکان، وە یاپێوەری هەڵسوکەوت لە کۆمەڵگەدا، هەروەها توانای کارلێك و ئاوێتەبوون لەگەڵ کۆمەڵگە.
- کەسێکی خاوەن ڕەوشتی جوان:- ئەمیش بەپێی ئەونموونە بالآیانەی سەبارەت بە ئاکاری جوان و پەسەندکراوی نێو کۆمەڵ و ئەو هەڵسوکەوتانەی کە کۆمەڵگە بە باشیان دەزانێت.
- تاکێکی باش لە خێزان و کۆمەڵگەدا:- لەڕێی وەرگرتنی ئەو سیفەتەو خەسڵەتانەی تاکە کەس دەبێتە خاوەنیان و دەیکەنە ئەندامێکی باش و بەسود لەنێو خێزاندا بێت، یاخود لەنێو کۆمەڵگادا. ئەویش بەو جۆرەی کە تاکەکان

بتوانن ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن و لە بەرامبەریشدا مافەکانیان وەدەستبهێنن، وە هەست بەپابەندبوونێکی نیشتمانی و نەتەوەیی بکات بەو رادەیەی لەتوانایدا بێت خزمەت بە نیشتمان و نەتەوەکەی بکات ئامادەی بەرگریکردن بێت لە نیشتمانەکەی.

- کەسێکی سەرکەوتوو لەپیشەکەیدا:- ئەویش بەهۆی زانیاری و شارەزاییەکانیەوە کە دەتوانێت بە سودبینین لەمانە ببێتە کەسێکی سەرکەوتوو لە شوێنی کارو بەرهەمهێناندا.
- کەسێکی لێکۆڵەرەوەو هەوڵدەرێت هەمیشە بەهیوای بەرەوپێشچوون و پەرسەندندابێت لەرێی شێوازی زانستی بیرکردنەوەو بەردەوام لەپرۆسەی خۆفێرکردندایەو هەمیشە بەدوای زانست و زانیاری زیاتردا بگەرێت و راستی مەسەلەکان تاوتوێ بکات، بەمەش دەبێتە کەسێکی بەشدار لە پێشکەوتنی نیشتمانەکەیداو هاوکار دەبێت لە پێکەوەنانی دوارۆژدا.

ئەو خاڵانەی ئاماژەیان پێدرا کۆمەڵە ئەرکێکی سەرەکی و بنەرەتین لە پەروەردەیەکی مۆدێرن و سەردەمانەدا جێیان دەبێتەوە، پەروەردەیەکی کۆن و داڕزاو لەتوانایدا نابێت فەراهەمیان بکات.

## ٢-ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی پەروەردە:-

ئامانجە تاکە کەسیەکانی پەروەردە لە سەرەنجامدا هەر دەکەنەوە ئامانجە کۆمەڵایەتیەکانی ئەم پرۆسەیە، چونکە پێگەیاندن و پەروەردەکردنی تاکە کەس بەواتای هێنانەدی ئامانجی کۆمەڵایەتی دێن، بەڵام ژمارەیەك ئامانج و بەرپرسیارێتی بەدی دەکرێن کە لەپێداویستیە هەرە سەرەکیەکانی پەروەردەن و مۆرکێکی گشتیان هەیە لەم پرۆسەیەدا ڕاستەوخۆ ئاڕاستەی کۆمەڵگا کراون، وەك لەم خاڵانەی خوارەوەدا کورتیان دەکەینەوە:-

١- پاراستنی کلتوری ڕۆشنبیری کۆمەڵگە: لەڕێی گواستنەوەو گەیاندنی خوو نەریت و هەڵسوکەوت و شێوازو ڕێساکانی بیرکردنەوەی تاکە کەسی بۆ نەوە نوێکان تا ببنە هەڵگری ڕۆشنبیری کۆمەڵگەکەیان، ئەم پرۆسەیەش نەوە دوای نەوە درێژەی پێددرێت.

٢- هەڵبژاردنی کلتوری ڕۆشنبیری و نوێکردنەوەی: بە لابردن و ڕیشەکێشکردنی نادروست و نەشیاوەکان و ڕاستکردنەوەی هەندێك لە نەریت و شێوازی بیرکردنەوەو هەڵسوکەوتی ناپەسەند تا لەگەڵ ڕەوتی پێشکەوتن بگونجێن و هەمئاهەنگ و سازبکرێن بە شتگەلێکی باوو سەردەمیانە، جگە لەمەش دەبێت بەرەوپێشبردن وخستنەسەر (التطویر و الاضافة) لەرێی داهێنان و دەوڵەمەندکردنی ئەو کلتورە لەئارا بێت بە شێوازو شارەزایی نوێ.

٣- گۆڕینی کۆمەڵگەو بەرەوپێشبردنی:- لەرێی بەرهەمهێنانی فیکرو تیۆری نوێ و هەڵبژاردنی شێوازی تازە بۆ کارو بەرهەمهێنان و ئاوێتەبوونی کۆمەڵایەتی ئەمانەش پەرە دەدەنە توانای بەرەی داهێنەرانە، وە یا بەخشینی هەندێ بەهاو پێوەری هەڵسوکەوتەکان بە تاکەکانی کۆمەڵ کە هەستی یەکڕیزی و یەکپارچەیی کۆمەڵایەتیان تیا بەهێز دەکات و ئاسۆی پێشکەوتنی بۆ ئاوەڵا دەکات.

٤- بەشداریکردن لە هێنانەدی پەرەسەندنی گشتی و سەرتاسەریدا:- بەوەی کە هێزێکی کاری شارەزاو لێهاتوو، وە پڕ چەک بە زانست و تەکنەلۆجیا بەرهەم بهێنێت، لە هەموو بەش و پسپۆڕی و ئاڕاستەکاندا ئاڕاستەی ئەرك و پیشە پێویستەکانی پەرەسەندن و بەرەوپێشچوون بکرێن. ئەمانیش خزمەتگوزاری جۆراوجۆر لەناو ژینگەی لۆکاڵی خۆیان پێشکەش دەکەن و بەشداریەکی گەورە دەکەن لە پرۆسەی گەشەسەندن و پێشکەوتندا، بەهۆی ئەو لێکۆڵینەوانەی بۆ بەرەوپێشبردنی شێوازەکان و داهێنانی ئامرازی نوێ ئەنجامی دەدەن.

٥- بڵاوکردنەوەی وشیاری سیاسی:- ئەمیش بەهۆی چەسپاندنی بیرکردنەوەو بەهای سیاسیانە لە مێشکی نەوەکاندا بۆ لایەنگری وپشتگیریکردن لە سیستەمی سیاسی دەسەڵاتداو پەرەدان بە ئاڕاستەی بیری تاکەکەسان تا بتوانن ئەرکی نیشتمانی وسیاسی خۆیان بەجێ بهێنن و مافی دیموکراسیانەی خۆیان پیادە بکەن و ڕابهێنرێن کە بە چ شێوازێك بەرگریی لە کۆمەڵگەی مۆدێرن و هاوچەرخ بکەن، وە بەشداربن لە ڕاوبۆچوونەکان و چارەسەری ئەو کێشەو گرفتانەی ڕووبەڕووی کۆمەڵگاکەیان دەبنەوە.

بەرایی...

لەسەر ئەو بنەمایەی کە پەروەردە ئامرازی کۆمەڵگایەو دەکەوێتە ژێر هەمان ئەو کاریگەریانەی لەناو کۆمەڵگەدا ڕوودەدەن جا ئەو گۆڕانکاریانە پەیوەندیان بە ئەزموون و شارەزاییەکانی ڕابردووەوە بێت، یاخود ئەوەی لە ئێستادا هەن، وە یا ئەو گۆڕانکاریانەی لە داهاتوودا چاوەڕێی ڕوودانیان دەکرێت. کەواتە پەروەردە (بوون)و پێکهاتەی خۆی لە گۆشەو ڕەهەندە جیاوازەکانی کۆمەڵگاوە وەردەگرێت و دەشبێتە نوێنەری کۆمەڵ و پارێزگاری لە بوون و مانەوەو بەردەوپێشچوونی دەکات بەهۆی ئەو فیکرو میتۆدەی پەروەردە هەیەتی، هەروەها کارلێك و ئاوێتەبوونێك لەنێوان پەروەردەو لقەکانی زانست هەیە، وە پەروەردە دەبێتە ئەو بوارەی کە دەرەنجامی زانستی جۆراوجۆری تێداپراکتیزە دەکرێت، بەجۆرێك لەیەك کاتدا زانستیش و هونەریانەش بێت، وە گونجاوو سازگار بە سروشتی پەروەردەو ئەو ئامانجانەی لەپێناویدا پەروەردە سەر هەڵدەدات.

پەروەردە سود لە لقە جیاوازەکانی زانست وەردەگرێت و دەیانکاتە بنەمای پێکهاتنی بەشە جۆراوجۆرەکانی وەك: ڕێکخستن و ناوەڕۆك و شێواز، هەروەها دیدو بۆچوون و چارەسەرەکانی. هەر پێشکەوتنێك لە بواری زانستی و زانیاریدا ڕوویدات ئەوا ڕەنگدانەوەی لەسەر پەروەردە دەبێت و ئەم پرۆسەیەش پێشکەوتن

بەخۆیەوە دەبینێت، چونکە پەروەردە زانست و زانیاریەکان دەکاتە بنەڕەتێک بۆ دیلو بۆچوونەکانی و پێکهاتەی خۆی پێ بەهێزو ڕێکدەخات،پرۆسەکانی بە ئاڕاستەیەکی داهێنەرانە بەرەودوا ئامانجەکانی دەبات.

لەم ڕوونکردنەوەیەدا دەردەکەوێت پەروەردە بنەما جیاوازەکانی خۆی لە دوو سەرچاوەی سەرەکیەوە وەردەگرێت کە:

١. کۆمەڵگە بە ناوەڕۆکە کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیرییەکەوە:- لەم سەرچاوەیە ناوەڕۆکی فکریی خۆی دادەڕێژێت لە فەلسەفەو بەهاکان و ئامانج و پلانی وئاڕاستەی زانستی و شێوازەکانی دەبنە ئەو بنەڕەتەی کە ئەم پرۆسەیە درێژەپێدەدەن.

٢.لقەکانی زانست:- لەم سەرچاوەیەوە پەروەردە بنەما جۆراوجۆرە زانستیەکانی خۆی وەردەگرێت لە دروستکردنی ناوەڕۆکی پەروەردەییانەو فیکریەوە، سەرەڕای بابەتی جۆراوجۆری وەك پرۆگرام و پراکتیزەکردنی پرۆسەکە جا چ لە زانستە کۆمەڵایەتیەکانەوە، یاخود لە زانستی سروشتی پەتیەوە بێت.

هەر لەڕێی ئەم دوو سەرچاوەیە سیستمی پەروەردەیی و ناوەڕۆك و بونیادی پرۆسەکە دیاری دەکرێت، سەرەڕای تێگەشتن و ڕاقەکردنی پەروەردە ئاڕاستەکردنی بەو ئاقارەی بگاتە دوا مەبەستی خۆی. هەمان ئەو دوو سەرچاوەیە لەگەڵ پەروەردەدا لەپرۆسەیەکی کارلێککردنی بەردەوام و هەمیشەییدان، هەر بەرەوپێشچوونێك، یا گۆڕانکارییەك بەسەر بنەماکاندا بێن

ئەوا لە پەروەردەدا ڕەنگدەدەنەوە، یاخود یارمەتیدەر دەبن بۆ ڕاستکردنەوەی بۆچوون و ناڕاستەیەکی چەوت، یاخود نوێکردنەوەی ناوەڕۆك، وە یاخود چارەسەرکردنی گرفتێك، وە یا چاککردنەوە لە جێبەجێکردندا. وە دەرەنجامەکانی پەروەردەش بەهەمان شێوە کاریگەری لەسەر ئەو دوو سەرچاوەیە جێدێڵن لەڕووی بەردەوامبوون وپێشکەوتنی ژیانی کۆمەڵگەو دووبارە بەرەوپێشبردنی ئەو زانستانە. ئەمانەی لە خوارەوە باس دەکرێن چەند ئاماژەو ڕوونکردنەوەی کورت وخێران بۆئەوەی ئەو بنەما سەرەکیانەی کە پرۆسەی پەروەردە پشتیان پێ دەبەستێت لە دوا دەرەنجامیشدا تێبینی ئەوە دەکرێت سەرجەم ئەم بنەمایانە هاریکاری یەکتر دەکەن لە پرۆسەی پەروەردەییداو پێکەوە تەواوکارییەکی کەم وێنە و دەگمەن پێك دێنن کە ئەویش پەروەردەیە:

بنەماکانی ئەمانەن:

١. بنەمای ئایینی
٢. بنەمای مێژوویی
٣. بنەمای کۆمەڵایەتی و کلتوری
٤. بنەمای ئابووری
٥. بنەمای ڕامیاری
٦. بنەمای کارگێڕی و بەڕێوەبردن
٧. بنەمای دەروونی
٨. بنەمای فەلسەفی

## ١- بنەما ئایینیەكانی پەروەردە:-

ئەم بنەمایە یاساو ڕێساو بنەڕەتــە جیاوازەكـانی بیروبـاوەڕی ئـایینی لـەخۆ دەگرێت كە كۆمەڵ بڕوای پێیان هێناوەو نەتەوە كردویەتیە ئایینی خۆی.لێرەدا پەروەردە دەكرێتە دەزگایەكی تایبەت بۆ چاندنی تۆوی باوەڕداریتی ئەو ئایینەی كە كۆمەڵگا دەیەوێت لە ناخی نەوەكاندا بیچێنێت. بنەمای ئایینیش دادەنرێت بە یەكەمین و سەرەكیترین بنـەما بـۆ داڕشـتنەوەی بـیرو فەلـسـەفەی پرۆسـەی پەروەردەیی چ لە دانـان و ڕێكخـستنەوەدا بێـت، یـاخود وەك ئـەوەی بكرێتـە ئاڕاستەو باكگراوندێك بۆ ئەو مەبەستانەی لە داڕشتنەوەی سیاسـەتی فێركردن و بوارەكانی ئامانجە پەروەردەییەكان ڕەچاو دەكرێن.

ئەم بنەمایەش لە وڵاتانی وەك نیشتمانی عـەرەب و دەوڵەتە ئیسلامیەكان پلەیەكی باڵاو پانتاییەكی فراوان داگیردەكات، بەجۆرێك لە زۆربەی ئەم وڵاتانەدا دەكرێتە ئاڕاستەكەرو ڕێنیشاندەر بۆ سەرتاسەری پرۆسەی پەروەردەیی.پێچەوانەی دەوڵەتە سكۆلارەكان (عەلمانی)ی سەرمایەداری، یاخود سۆسیالیـست كـە ئـەم بنەمایە لە چوارچێوەیەكی كلتوری ڕۆشنبیری و كۆمەڵایەتیدا تێپەڕ ناكـات، وە لە بواری لێكۆڵینەوە كۆمەڵایەتیەكاندا دادەنرێت و جەخت لەسـەر ئـەو لایەنـە ڕەوشتیانەیان دەكرێتەوە كە پەروەردە هەوڵیان بۆ دەدات.

### ٢-بنەما مێژووییەکانی پەروەردە:-

ئەو هێزو کاریگەریانە لەخۆ دەگرێت کە لە چوارچێوەیەکی مێژوویدا بزاوتی کۆمەڵ و ئەو گۆڕانکاریانەی بەدرێژایی مێژوو بەسەر کۆمەڵگادا هاتوون ڕووندەکاتەوە وە ڕەنگدانەوەی ئەو کاریگەریانە لەسەر پرۆسەی پەروەردەیی دەردەخات و هەڵقولاوی ئەو پەیوەندییە دیالێکتیکیەی (الجدلي) نێوان هێزی پەروەردەیی و هۆکارو هێزە کۆمەلأیەتیەکان دەبێت،چونکە هێزی پەروەردەیی تیۆرو ئامانج و سیستم و ڕێکخستنە فێرکاریەکانی لەخۆ دەگرێت، کە ئەمانیش کۆمەڵێك ڕاستی و هۆکارو بەڵگەنەویستن لە ئێستادا خاڵی دەبنەوە کاریگەریشیان لەسەر شێوازو دەرەنجامەکانی پەروەردەدا دەبێت.

پەروەردەش یەکەیەکی سەربەخۆ نیە لە کات و شوێندا، بەڵکو یەکێتیەکی ئەندامی پێکهاتەی نەتەوەییە، ڕێکخستنێکی کۆمەلأیەتیە کە زۆرترین کارلێکی نەك تەنها لەگەڵ دەوروبەرو ئێستادا هەیە، بەڵکو ئاوێتەبوون و کارلێکی لەگەڵ ڕابردووشدا هەیە، ئەمیش لەڕێی ئەو هێزو هۆکارە کۆمەلأیەتیانەی-لە ڕابردوودا پێکهاتوون و تا ئێستاش بەجۆرێك لە جۆرەکان درێژیان هەیە. کەواتە پەروەردە بەم شێوازەی ئێستای ڕیشەی مێژینەیی خۆی هەیە، ئەم بنەڕەتە مێژووییەش بەشێکە لە ئێستای پەروەردە، وە بەو پێیەی پرۆسەکە ئامرازێکی کۆمەلأیەتیە، کەواتە وێنەو ڕەنگدانەوەی ئەو چوارچێوە کلتوریەیە کە کۆمەڵگە لەژێر کاریگەرێتیدایە، وە بۆ دواجاریش دەرەنجامێکی مێژووییەو تێکەڵ بە ئێستایە.

هەر لێرەوە بنەمای مێژوویی بوار دەڕەخسێنێت شارەزاییمان سەبارەت بەو پێکهاتە بۆماوەییە هەبێت کە ڕابردوو گەیاندویەتی بە پەروەردە.

سەرەڕای زانیاری دەربارەی ئاوێتەبوونی کۆن لەگەڵ نوێدا، وە ئەو گرفتانەی لە دەرەنجامی ئەم تێکەڵبوونە دروست بوون، هەروەها زانین و ڕوونکردنەوەی چۆنێتی ڕووبەڕووبوونەوەی کۆمەڵگا جیاوازەکانە لە بەرامبەر ئەو بارودۆخە جیاوازو گرفتانەی تووشیان هاتووە.

لێکۆڵینەوەی بنەما مێژوویەکانی پەروەردە یارمەتیدەرمان دەبێت بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئێستای پرۆسەکەو حاڵیبوون لە پەیوەندی پەروەردەو کاریگەرییەکانی لەسەر سیستمە کۆمەڵایەتیەکان، هەروەها سودمەند دەبین لەو ئەزموونانە بۆ بونیادنانی دیدێکی پەروەردەییانەو هەڵسەنگاندن و ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتەکان، چونکە کێشەو ئاستەنگە پەروەردییەکانی ئێستا ڕیشەی مێژینەییان هەیە، بۆ نموونە ئەو بەکەم سەیرکردنەی خوێندنە پیشەییەکان دەگەڕێتەوە بۆ بیرکردنەوەیەکی کۆن و نابابەتی کۆمەڵگا کە بە چاوێکی بێ ڕێزەوە سەیری پیشەوەرەکانیان کردبوو، ئەمەش لە ڕابردوویەکی دێرینەوە سەرچاوەی گرتبوو.

وە پەروەردە هەمیشە پێویستی بە بەخۆداچوونەوەیەکی مێژووییانە هەیە لەژێر ڕۆشنایی ئەو بارەی ئێستا تێیدایە بەوەی لەژێر کاریگەری ڕابردوویدایە، چونکە ئەو ڕابردووە پەل دەکێشێتە ناو ئێستاوە، وە بۆهێنانەدی داهاتوویەکی

باش دەبێت هەمیشە لە پشکنینی ئەو ڕابردووەدا بێت ئەویش بە ڕوونکردنەوەو تیشکخستنە سەر بزاوتی هێزە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و خاڵی دژایەتی و بەیەکگەشتنەوەی نێوانیان. دەبێت ئەوەش ڕوونبکرێتەوە کە ئامانجی ڕاڤەکردنی مێژوو تەنها تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئێستاو ڕووبەڕووبوونەوەی گرفتەکان نیە، بەڵکو درێژەپێدان و ئاڕاستەکردنی دیلو بۆچوونەکانی ئێستایە بەرەو داهاتوو و پێکهێنانی دواڕۆژ، ئەم تێگەیشتنەش نرخێکی نابێت گەر یارمەتیدەر نەبێت بۆ تێگەشتن لە ئێستامان و نەتوانێت هەنگاو بەرەو داهاتوو بنێت.

## ٢- بنەما کۆمەڵایەتی و کلتورییەکانی پەروەردە:-

وەك پێشتر باسکرا پەروەردە لەنێوەندێکی، یا ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیدا نەبێت دەرەنجامی نابێت، وە مرۆڤیش ناتوانێت خودێتی مرۆییانەی بەدیبهێنێت گەر لەنێوەندێکی کۆمەڵایەتیدا نەبێت، دەروازەی ڕاستەقینە بۆ تێگەشتن لەم پرۆسەیە پێویستە لە گۆشەنیگای تاك و کۆمەڵ و ئەو ژینگەیەوە بێت کە لەیەکەیەکی کارلێك و تەواوکاردایە، و ئەم هۆکارانەش سیستم و بەهاو خوو و نەریت و پەیوەندییەکان دادەمەزرێنن، ئەمانیش سەرجەم دەبنە پێکهێنەری کۆمەڵ و شێوازی ژیانی. لەو کاتەیدا پەروەردە بنەماکانی خۆی لە کۆمەڵەوە وەردەگرێت ئەوا ئەرکێکی کۆمەڵایەتی دەبێت کە ئامانجی گۆڕینی تاکە لەو جۆرەی کە بەزۆر (ناچاری) بۆتە هاولاتی بەهۆی لەدایکبوونیەوە لەم

کۆمەڵگەیەدا، بۆ هاوڵاتیەك بەڕاستی ڕۆڵی کۆمەڵایەتی و ئەرکەکانی لەنێوەندی کلتوری کۆمەڵەکەیدا هەست پێ بکات واتا ئەو کلتورەی پەروەردە لە هەوڵی بەردەوامبوونیدایە لە خودی تاکەکانی کۆمەڵدا،چونکە ڕۆشنبیری لە ساتی لەدایکبوونی تاکەکانەوە دەستپێدەکات و بە وێنەی بۆماوەییش ناگوێزرێتەوە وەك چۆن ڕەنگی پێست و چاو و قژ لەڕێی بۆماوەیی (الوراثة) دەمێنێتەوە. ڕۆشنبیری لەڕێی فێربوون و ڕاهێنان و مەشقکردنەوە پێك دێت، بەمەش پەروەردە دەبێتە پرۆسەیەکی دروستکردنی کۆمەڵایەتی و نوێبوونەوەی ڕۆشنبیری، بەو مانایەی گەشەو پەرەدانە بە تواناکانی تاکە کەس لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتیداو پێکهێنانی ئاراستەکانی بیرکردنەوەو بەرەوپێشچوون و وشیارکردنەوەیە بۆ ئەو مەبەست و ئامانجانەی تاك و کۆمەڵ لە هەوڵی بەدیهێنانیدان. ئەم بۆچوونە نوێیە کە لە زانستی کۆمەڵناسی و مرۆڤزانیەوە سەرچاوە دەگرێت ئەو دیدو بۆچوونانەی گۆڕی کە پەروەردەیان بە پرۆسەیەکی تاکە کەسی دادەنا، بەڵکو سەلماندی کە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی و ڕۆشنبیری گشتگیرو سەرتاسەرییە بۆ هەموو لایەنەکانی پرۆسەی پەروەردەیی، چ ئەوانەی لەناو خوێندنگاکانداو سەربە سیستمی پەروەردەیین، یا خود ئەو پرۆسە پەروەردەییانەی لە دەرەوەی ئەم دەزگایە ئەنجام دەدرێن.

بەهۆی بەرفراوانبوونی بوارەکانی زانستی کۆمەڵناسی و دەرکەوتنی چەندەها لقی پەیوەندیدار بەم زانستەوە، وە یا بەهۆی هاوکاریکردنی زانستە

کۆمەڵایەتیەکانی دیکەوە زانستێکی نوێ هاتە کایەوە بەناوی (زانستی کۆمەڵناسیی پەروەردەیی- علم الاجتماع التربوی-) ئەمیش بۆتە پردو گەیەنەری نێوان کۆمەڵناسی و پەروەردە. ئەم زانستەش تایبەتمەندە بە پراکتیزەکردنی ڕێساو بنەما کۆمەڵایەتیەکان لە بواری پەروەردەییدا چ لەنێو، یاخود لە دەرەوەی دامەزراوە فێرکاریەکاندا بێت.

ئامانجی زانستی کۆمەڵایەتیە پەروەردەیەکان:

* دەرخستنی ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانی دیاردەو سیستمە فێرکاریەکانە، وە گەشتنە بەو یاسایانەی ئەمانەی دەکەونە ژێر ڕکێفەوە.

* گەڕان بەدوای ڕۆڵی پەروەردە لە پێکهێنان و دروستکردنی ڕۆشنبیریداو کاریگەری ئەم پرۆسەیە لەسەر ئەو زانیاریانەی لاوان و تازەپێگەشتوان فێری بوون.

* دیاریکردنی ئامانجە پەروەردەییەکان و قوڵترکردنی دیدی فێرکاران بۆ ئەرکە پەروەردەییەکان و دامەزراوەکانی.

* بەکارخستنی زانین (المعرفه) بە شێوازێکی کۆمەڵایەتیانەو لەپاشاندا پێدانی زانیاری بە کەسانی پسپۆڕ وەك ئەنجامدەران و جێبەجێکەرانی سیاسەتی پەروەردەیی سەبارەت بەوەی کە پەروەردە دەبێت ئێستا چۆن بێت و چاکسازی و بەرەوپێشبردنی بارودۆخی سیستمی پەروەردەیی چۆن دەکرێت.

* لەپاڵ ئەمانەدا زانستی کۆمەڵایەتی پەروەردەیی دەتوانێت لێکۆڵینەوە ئەنجام بدات سەبارەت بە کاریگەرییە جۆراوجۆرەکانی نەخشەی سیاسەتی فێرکاری و پرۆگرامەکانی خوێندن و شێوازەکانی وانەوتنەوەو چالاکییە خوێندنگاییەکان و دیاریکردنی جۆری پەیوەندییەکان، هەروەها لەسەر ڕۆڵی پیشەی فێرکردن لە واقعێکدا لە گۆڕانکاری بەردەوامدایە.

* لێکۆڵینەوەی زانستی مرۆڤزانی و کۆمەڵناسی پەروەردەییانە چەندین تایبەتمەندی و شێوازو چەمکگەلێك پێشکەش دەکەن کە دەبنە ڕێبرۆشنکەرەوەی پرۆسەی پەروەردەیی و ناوەڕۆکەکەی، بەم هۆیەوە ئەوەکان بۆ نێوەندێکی کۆمەڵایەتی ڕۆشنبیری پێدەگەیەنن لەڕێی بەگەرخستنی ئەو شارەزایی و لێزانی و زانیاریانەی هەیانە سەرەڕای یارمەتیدانی فێرکاران و پەروەردەکاران کە خۆیان لە چی بپارێزن و دووردەپەرێزی بکەن.

**٤- بنەما ئابوورییەکانی پەروەردە:-**

پرۆسەی پەروەردەیی چەندین بنەمای ئابووریانەی هەیە،لە سەرەتاوە بەهۆی ئەو دەرەنجامە ئابووریانەی هاتنە نێو ئەم کایەوە گۆڕانکاری بەسەر ئەو دیدو بۆچوونەدا هێنا کە پەروەردەی دادەنا بە گەشەدان و پەرەسەندنی ژیری و ڕەوشت، کە لە ئێستادا ئەم بۆچوونە بووە بە: (پەروەردە بنەمایەکی بنەڕەتیە بۆ گەشەسەندنی ئابووری و کەڵەکەبوونی سامان و پێشکەوتن لەڕێی زیادبوونی

سەرمایەی مرۆییانە)، ئەمەش لە خۆیدا ڕەهەندێکی ئابووریانەی بەخشیە پرۆسەی پەروەردەیی و پەیوەندی تۆکمەی نێوان ئابووری و پەروەردەی خستەڕوو. پەروەردەش بەو جۆرە نەمایەوە کە تەنها خزمەتگوزاریەکی گشتی بێت، بەڵکو بۆتە پرۆسەیەکی ئابووریانەی وەبەرهێنەر بەجۆرێك داهات و دەسکەوتی ئابووریانەی تاکە کەسی، یاخود کۆمەڵایەتی بەو جۆرەی لێدەرەخسێت کە ڕێژەی سودەکەی فرەتر بێت لە زۆر پرۆژەی ئابووریانەی دیکە.

بەهۆی پێشکەتنی زانستی ئابووری و فرەبیبوونی لق و پسپۆڕێتیەکانی زانستێکی نوێ بەناوی (زانستە ئابووریەکانی فێربوون— علم اقتصاديات التعليم) هاتە ئارا، ئەرکی ئەم زانستە پراکتیزەکردنی بنەما ئابووریە گونجاوەکانە لە بواری پەروەردددا. دیدی ئابووریانەی نوێ ئەو ڕاستیەی سەلماندووە کە پرۆسەی بەرهەمهێنان بەتایبەت لەگەڵ ئەو پێشکەوتنە تەکنەلۆجیەو وەبەرهەمهێنانی سامانی سروشتی، یاخود پێکەوەنانی سامانی نوێ بەتەواوی پشت دەبەستێت بەو هێزی کارەی کە پڕچەکە بە زانیاری و شارەزاییەکان و ئاراستە نوێیەکانی سەردەم و پرۆسەی بەرهەمهێنان بەرێوە دەبات.

پەروەردەش تەنها ڕێگەیە بۆ بەدەستهێنانی ئەم شارەزایی و لێزانیە، هەر بۆیە دەبینین ئامادەکردن و ڕاهێنانی هێزی کار بۆتە مەرجێکی پێویست لە پرۆسەی گەشەسەندن و پەرەی ئابووری و کۆمەڵایەتی و پێشکەوتنی تەکنەلۆجی. لە ئێستادا ڕاستیەك ڕوونبۆتەوە و جێگەی هیچ گومانێکیش نیە: ئەو هێزە

مرۆییە ئامادەو مەشقپێکراوەی بوارە جیاوازەکانی کارو بەرهەمهێنان بە بەرزترین سەرچاوەی ئابووری دەژمێردرێت، چونکە لە ئێستادا ئەو ڕاستیە سەلێنراوە کە )پێوەری هەر کۆمەلگایەك بەهێزی کارەکەیەوە بەندە نەك بە ڕێژەی ئەو کانزاو سامانە سروشتیانەی لەوڵاتەکەدا هەیە.)

بۆئەوەی پەروەردە بە ئەرکی ئابووریانەی خۆی هەستێت بەو پێیەی پێکهاتەیەکی سەرەکیە لە گەشەسەندنی ئابووری و کۆمەڵایەتیدا، ئەوا چوارچێوەی ئامانجەکانی خۆی لە ئابووریەوە وەردەگرێت و پرۆگرام و ڕێبازەکانی خۆی لەسەر بنیات دەنێت، ئەمەش لەڕووی چەندایەتی و چۆنایەتیەوە: چەندایەتی وەك جێبەجێکردنی خواست و پێداویستیەکانی هێزی کار، وە چۆنایەتی وەك ئەو توانای لێهاتوویی و شارەزایی و زانیاریانەی پێشکەش بە هێزی کاری (القوى العاملة) دەکات.

بۆ دڵنیابوون لە جێبەجێکردنی ئەرکە ئابووریەکانی پەروەردە بە باشترین شێواز، پەروردە شێوازی پلان و نەخشەدانان لە ئابووریەوە دەخوازێت بۆئەوەی لە توانایدا بێت سەرچاوەکانی بەجۆرێکی چالاك و تەواو لە هێنانەدی و وەبەرهەمهێنان بخاتەگەڕ.

پەروەردە بڕێکی زۆر لە دەرەنجامەکانی ئابووری وەك نەخشەو پلاندانان وەردەگرێت بۆئەوەی لێکۆڵینەوەی پرۆسەی پەروەردەیی وەك زانستێکی پڕچەك بە بنەما زانستیەکانەوە بکات:- بڕی خەرجی و تێچوونی فێرکردن، داینکردنی

سەرچاوەی ماڵی و دارایی فێرکردن، هەروەها دانانی بوجەیەک بۆ بڕی تێچوونی پرۆسەکە، سەرەڕای وەرگرتنی پرۆسەی پەروەردە بۆ چەند شێوازێکی ژمێریاری و پێوانەیی لە زانستی ئابووریەوە، وە دانانی نەخشەو پلان بۆ لێکۆڵینەوەی هێزی کارو لێکدانەوەی داهاتوو و پێشبینیکردنی دەربارەی پێداویستیەکانی و چەندەها وردەکاری دیکە... ئەمانەش لەڕێی دارشتنی پلانی کورت، یا درێژخایەنی نەتەوەییەوە، سەرەڕای دیاریکردنی سیماو سیفاتەکانی هێزی کارو ئاستی پیشەو کارەکان لەڕێی بەکارهێنانی شێوازی ژمێریاری.

**٥- بنەما رامیاریەکانی پەروەردە:-**

بەدرێژایی مێژوو پەروەردە ڕووخسارو خەسڵەتی پێکهاتە جۆراوجۆرەکانی خۆی لە سیستمە ڕامیاریەکانەوە وەرگرتووە، سەردەمەکانی پێشوو لە زۆربەی کۆمەڵەکاندا ئەم پرۆسەیە ببووە هاوشێوەیەکی ڕژێمە فەرمانڕەواکان و ئامانجەکانیان، بەردەوامبوونی ئەم ئەم جۆرە کارلێک و کاریگەریانە چەندین شێوازی پەروەردەیی هێنایە کایەوە:- پەروەردەی دیموکراسی، سەرکوتکەرانە (دیکتاتۆریانە)،خانەدانی (النبلاء)، سۆسیالیستی، ڕەگەزپەرستی،... هتد.

هەریەک لەم جۆرە پەروەردانە لەو هەوڵەدا بوون کە هاوڵاتیەک پێبگەیەنن تەواو هەمان ئاڕاستەی فیکری دەسەڵاتدارانی سیاسیان هەبێت و لەپێناو مانەوەو درێژەدان بەو فەرمانڕەوایەتیە کاربکەن و بیربکەنەوە، هەر ئەم هۆکارو

کاریگەریەش بوو کە جیاوازی و لێکنەچوونی چەمك و ئامانجە پەروەردەییەکانی دروستکرد.

هەرچەندە لە سەردەمی ئێستاماندا پەروەردە لە ئەرك و ئامانجەکانیدا بە هاوسەنگی و سەرتاسەری دەناسرێتەوە، بەڵام لەگەڵ ئەمەشدا هۆکارو کاریگەری ڕامیاری زۆر بە زەقی و بەرجەستەیی لەسەر سیستمی پەروەردە بەدی دەکرێت، تەنانەت بە ئاراستە نەشیاوو خراپەکەیەوە.

لەبەرئەوەی پەروەردە ئامرازێکی مەزنی بانگەشەکردنە بۆ سیستمە ڕامیاریەکان و بەرجەستەکەری ئاراستەی ئەم ڕژێمانەیە لە واقعدا بەهۆی ئامانج و بیروڕاو بەدەستهێنانی لایەنگرو پارێزەرانی ئاراستە فیکریەکان، زۆربەی بزاوتە چاکسازو شۆڕشگێڕەکان پەنا دەبەنە بەر ئەم پرۆسەیە بۆئەوەی نەوەیەکیان بۆ پێبگەیەنێت کە بڕوای تەواویان بە بۆچوونەکانیان هەبێت و ئامادەی بەرجەستەکردن و داکۆکی لەم بۆچوونەیان بکەن و لەگەڵ ئەو گۆڕانکاری و چاکسازی خواستانەی هەیانە تەبابن تا درێژەپێدەری ڕێبازەکە بن و پێ بەپێی دەسەڵاتی فەرمانڕەوایەتیان بەرەو پێش بچن.

لە کۆمەڵگە دیموکراسیەکاندا فەرمانڕەوایەتی لەلایەن خودی گەلەوە بەڕێدەچێت، بنەمای ڕامیاری بایەخ و گرنگی ئێجگار زۆریان پێدەدرێت،لەبەر ئەمەیە ئەرکی پەروەردە لەم سیستمە دیموکراسیانە دەکرێت پێگەیاندنی نەوەکان

بەجۆرێك بە مافە سیاسیەکانی خۆیان بگەن و لەهەمان کاتدا ئەرکی سیاسیانەی خۆیان جێبەجێ بکەن.

**٦- بنەمای کارگێڕی و بەڕێوەبردن لە پەروەردەدا:-**

پاش ئەو شۆڕشی کارگێڕی و بەڕێوەبردنە (الثورة الاداریة) کە سەرجەم کۆمەڵگا هاوچەرخەکانی گرتەوە، پەیوەندی نێوان پەروەردەو بەڕێوەبردن تونلوتۆڵ و تۆکمە بوو، وەك هەموو دەزگاکانی دیکەی کۆمەڵگە، ئەمەش وەك پێداویستییەك بۆ بەرەوپێشچوون و پەرەسەندنی سیستمی پەروەردەیی.
پەروەردەش زیاتر ئاوێتەی دەرەنجامەکانی زانستی بەڕێوەبردن کرا، بووە هۆی هاتنەکایەی چەندەها چەمکی پەروەردەییانەی شیاو و گونجاو بە سیستمی فێرکردن. هەروەها ئاستی بەڕێوەبردنی جۆراوجۆرو شێوازی نوێ هاتنە کایەکە سەرچاوەکەیان زانستی بەڕێوەبردنی گشتی بوو، بەڵام ئەمانە بەجۆرێك گونجاندن و گۆڕانکاریان بەسەردا هێنرا کە لەگەڵ بارودۆخ و تایبەتمەندێتی فێرکردن لە هەر وڵاتێك پیادە بکرێن.

لێرەوە ڕوون دەبێتەوە کە پەروەردە تیۆرو بنەماو شێوازی بەڕێوەبردنی و کارگێڕیەکەی کەپەیکەری ڕێکخستنی پەروەردەیان

لێ پێکهاتووە،لە زانستی بەڕێوەبردنی گشتیەوە وەرگرتووە. سەرەڕای دابەشکردنی پسپۆڕێتی و لێپرسراوێتی و ئەرکی بەڕێوەبردن و دانانی یاساو

ڕێسای بەڕێوەبردن و چەندین کارو ئەرکی دیکەش. کە هەموویان لەپێناو بەدیهێنانی ئامانجەکانی پەروەردەدان.

ئەوەی جەختی لەسەر دەکرێتەوە: سەرکەوتن و کارایی هەر سیستەمێکی پەروەردەیی تارادەیەکی زۆر گرێدراوی جۆری بەڕێوەبردنە.

وە پەروەردە بەشێك لە ناوەڕۆکی پرۆسەکانی و بابەتە زانستیەکانی کە تایبەت بە ئامادەکردنی پێکهاتەی مرۆییە لە زانستی کارگێڕی و بەڕێوەبردنەوە وەرگرتووە، مەبەستمان ئەو ناوەڕۆکەی پەرە بە کەسایەتی دەدات وەك توانا و بەهرەو بەهاکان و ئاڕاستەکردنیان بەرەو مەیدانی کارو بەرهەمهێنان و ڕێکخستن، ئەمەش لە خۆیدا ئەو مانایە دەگەیەنێت کە مرۆڤەکان بە ئەرکی ئابووری و کۆمەڵایەتی و ڕامیاریەکان هەستابن. وە تا چ ڕادیەك پەروەردە پشت بە بنەمای بەڕێوەبردن دەبەستێت و سوودی لێ وەردەگرێت، ئەوا ئەو توانایەی پێدەبەخشێت کە ڕێکخستن هەبێت لەنێوان سیستەمە فێرکاریەکان و پێکهاتەکانیاندا، ئەمەش دەکاتە کۆنترۆڵکردنی پرۆسەکانی خوێندن و ئاڕاستەکردنیان، هەروەها وەرگێڕان (ترجمة) بەکردار بۆ تیۆرەو بیردۆزەکان لە ژیانی ڕاستەقینەدا، لە مانەش گرنگتر ئەو توانایە بەپەروەردە دەدات کە بە بەردەوامی پشکنین و پێداچوونەوەو هەڵسەنگاندن بۆ سیستەمی بەڕێوەبردن و فێرکردن ئەنجام بدات. وە هەمیشە نوێترین زانیاری و داهێنان لەم سیستەمەدا ئامادەیی هەبێت.

کەواتە برەودان و بەرزکردنەوەی توانای فێرکردن و کارایی و چالاککردنی ئەم پرۆسەیە پێویستی بە وشیاری بەکارخستنی ئەو پێشکەوتن و پەرەسەندنە خێرایەی بواری بەڕێوەبردن هەیە.

**٧- بنەما دەروونیەکانی پەروەردە:-**

لەو ساتەی بنەما دەروونیەکان هاتنە نێو کایەی پەروەردەوە گۆڕانکاری مەزن و بەرچاویان لەم پرۆسەیە بەدیهێناوە، بوونەتە هۆی گۆڕینی سروشتی چەمك و شێوازە پەروەردەییەکان بۆ نموونە ئەو بۆچوونەی سەبارەت بە سروشتی فێرخوازو تایبەتمەندیەکانەوە هەیە کە دەبێت بە گرنگی و بایەخەوە سەرنجی بدرێتێ لە پرۆسەی پەروەردەو فێرکردندا.

دوابەدوای خۆی گۆڕان بەسەر ئەو ئەرکەی پەروەردەدا بهێنرێت کە ئەرکی پەروەردە تەنها بریتیبێت لە دروستکردنی خوو نەریتی تاکە کەس و پێکهێنەری ئەم لایەنە بێت، بەڵکو ئەرکی پەروەردە کرا بە: ئامرازی پێگەیاندنی کسایەتی و هێنانەدی مەرجە پێویستەکانی گەشەکردنی تاك لە ژینگەیەکی کۆمەڵایەتیدا. لەمەش گرنگتر پەروەردە چۆن دەتوانێت ئەو هاوسەنگی و گونجاندنە دروست بکات لەنێوان هێنانەدی ئامانجە کۆمەڵایەتیەکان و تایبەتمەندێتیەکانی تازەپێگەشتووان و پەروەردەکردنیان.

گەر پەروەردە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی بێت ئەوا لەرێی تاکەوە دەگاتە ئەم مەبەستە،چونکە گەر جەخت لە تاکە کەس بکاتەوە بەوەی کە تەوەری

پرۆسەکانی پەروەردەیە لە چوارچێوەیەکی کۆمەڵایەتیدا ئەوا لە دواجاردا مەبەست و ئامانجی تاکە کەس هەمان مەبەست و ئامانجی کۆمەڵە.

ئەم گۆڕانکاریانەش مەوداکانی پرۆسەی پەروەردەیان لە تاکدا ڕوونکردەوە، بەجۆرێك هەموو گرنگی و بایەخێك دەدرێت بە پێگەیاندن و پەرەسەندنی لایەنەکانی کەسایەتی تاك، وەك ئەو شارەزایی و توانایەی تاکە کەس خاوەنیانە، سەرەڕای بەخشینی کۆمەڵێك خوو نەریت کە گونجاوو سازگار بن بە ژینگە کۆمەڵایەتیەکە، لێرەدا ئەرکی پڕبایەخی زانستی دەروونناسی دەردەکەوێت، وەك ڕێکخستن و ئاراستەکردنیان لە گۆڕینی ئامانجە پەروەردەییەکان بۆ کۆمەڵە هەڵسوکەوتێکی کۆمەڵایەتیانە کە فێرخوازی تازەپێگەیشتوو لە قۆناغە جیاجیاکاندا وەریگرتوون.

هەروەها دەروونناسی ئەو ڕاستیە فەراهەم دەکات کە بەهۆیانەوە هەڵسوکەوت و تایبەتمەندێتیەکانی تازەپێگەشتووانی

پێ شیدەکرێنەوە لە قۆناغە جیاوازەکانی پەروەردەو فێرکردندا، دەکرێنە بنەمایەك بۆ ڕێکخستن و ئاراستەکردنیان، سەرەڕای هەڵبژاردنی شیاوترین و کاراترین شێوازی زانستیانەی فێرکردن بۆ پێکهێنانی پردێکی پەیوەندی لەنێوان دەروونناسی و پەروەردەدا زانستێکی نوێ بەناوی (زانستی دەروونناسیی پەروەردەیی— علم النفس التربوي) هاتەکایەوە. ئەرکی ئەم زانستەش پشکنین و وردبینی پرۆسەکانی پەروەردەو فێرکردنە بەپێی ئەو ڕاستی و داهێنانە نوێیانەی

زانایان لە بواری: دەروونناسی گەشە، ئەکلینکی، سایکۆلۆژی فێربوون، پاڵنەرو وروژێنەرەکان... بەدەستیان هێناوە، ئەمەش لەپێناو بەرزکردنەوەی ئاستی پرۆسەی فێرکردن و پراکتیزەکردنی چەندین تاقیکردنەوەو ئەزموون لە پرۆگرامەکانی خوێندندا ئەنجام درا تا بزانرێت باشترین و گونجاوترین پرۆگرام دابڕێژرێت کە مەرجە سەرەکیەکانی فێربوون و چاودێری و وردبینی شێوازی وانەوتنەوەو گرفتەکانی خوێنکاران و چەندەها مەسەلەی دیکە لەخۆ بگرێت.

دەبێت ئەو کەسانەی لە بواری پەروەردەییدا کاردەکەن وشیاری و زانیاری گونجاویان سەبارەت بەو دەرەنجامە زانستی و داهێنانە نوێیانەی بواری دەروونناسی هەبێت،لەسەرووو هەموویشیانەوە مامۆستا، چونکە پێگەیەکی ئیجگار هەستیارو گرنگی لە پرۆسەی فێرکردندا هەیە، وە ئەرکێکی سەخت و ئاڵۆزی لەسەر شانە، چونکە مامەڵە لەگەڵ کۆمەڵێکی زۆر لە خوێندکاران دەکات، ئەمانەش لە ژینگەو پەروەردەی جیاوازەوە هاتوون و تواناو ئامادەیی جۆراوجۆریان تێدایە. هەر لەبەر ئەم هۆیە دەبێت پەروەردەکاران ئاگایی و زانیاریان دەربارەی تایبەتمەندێتی خوێندکاران و گەشەسەندنیان هەبێت، وە زۆر بەوردی و وشیاریەوە ئەرکی پەروەردەییان جێبەجێ بکەن، گەر ئەم خەسڵەتەیان تێدا نەبێت ئەوا شیاو و گونجاو نابن بۆ ئەم ئەرکە پیرۆزە کە پەروەردەیە.

دەتوانین بەشێوەیەکی گشتی بڵێین بنەمای دەروونی لەڕێی زانستی دەروونناسی پەروەردەییەوە چەندین تیۆرەو زانیاری و ڕاستی و دەرەنجامی

پڕاکتیکیان سەبارەت بە گەشەسەندن و تایبەتمەندێتی هەر تەمەنێك پێشكەش کردووە، کە شێوازی مامەڵەکردن بەجۆرێك ئەنجام دراو پڕ بەرهەم هێنراوەتە دی، وە بوونەتە پاڵپشتێکی بەهێز بۆ پەروەردە، و هۆکارن لە گەیشتنی ئەم پرۆسەیە بەدوا مەبەست و ئامانجی.

**٨- بنەما فەلسەفیەکانی پەروەردە:-**

پەیوەندی نێوان فەلسەفەو پەروەردە پەیوەندیەکی ئێجگار توندوتۆڵە بەهیچ جۆرێك ناکرێت و ناشێت لێك جودا بکرێنەوە، چونکە گەر فەلسەفە لە فیکر پێکهاتبێت، ئەوا پەروەردە پڕاکتیزەکردنی ئەو فیکرە دەکات و ئەمیش ئاراستەکانی بیرکردنەوەو ئامانجەکانیان دیاری دەکات، هەر پڕاکتیزەکردنە دەبێتە تاقیگە بۆ هزرەکان و لەرێی ئەمەوە بالاًیی و پەرەسەندنی خۆیان دەستەبەر دەکەن.

گەر فەلسەفە پەیوەندییەکی پتەوو بەتینی بە ژیانی هەر کۆمەڵگەیەکی مرۆڤایەتیەوە هەبێت و هیچ کۆمەڵگەیەکیش بێ فەلسەفە نەبێت، فەلسەفەش دیدو بۆچوون ئاراستەی بیرکردنەوەی ئەو کۆمەڵگەیەیە بۆ ژیان، لەبەرئەوەی پەروەردە سروشت و بوونی خۆی لەو دیدو بۆچوونەی ژیانەوە وەردەگرێت و ئامرازێکیشە بۆ دارشتنەوەی بەردەوامی و گۆڕانکاریەکانی ژیانی کۆمەڵگە بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ئەوا ئەم بوونەی خۆی واتە (پەروەردە) لە فەلسەفەوە وەردەگرێت، چونکە کاتێك فەلسەفە بوونی خۆی لە ژیانی کۆمەڵگەوە سەرچاوە

بگرێت، وە لەپاشاندا دەبێتە ئاڕاستەکەری ئەو ژیانە، ئەم پرۆسەی سەرخۆ بەخۆ دەکاتە پەروەردە، و مانای پەروەردە دەگەیەنێت.

لێرەوە تۆکمەیی پەیوەندی نێوان فەلسەفەو پەروەردە ڕوون دەبێتەوە کە وەك دوو ڕووی یەك دراویان لێهاتووە، دیوێکیان فەلسەفەی ژیانی کۆمەڵگە لەخۆ دەگرێت و دیوێکیسان پڕاکتیزەکردنی ئەو فەلسەفەیە لەخۆ دەگرێت کە پەروەردەیە.

لەو کاتەی کە ئێمە دەگەینە کۆمەڵە دەرەنجام و ڕاستیەکی هزریانەو لە شێوەی حوکم و بەڵگەنەویستەکاندا دایاندەڕێژین، ئەوا ئەمە بە ئەرك و کاری فەلسەفە دادەنرێت، بەڵام دەربڕین و پڕاکتیزەکردنی ئەو ڕاستی و دەرەنجامەو گۆڕینیان کۆمەڵێك چەمك و هەڵسوکەت و شارەزایی، ئەوا ئەمانەش دەبنە ئەرك و کاری پەروەردە.

فەلسەفە بەپێی سروشتی ڕەخنەگرانەی و تێڕامانی هەڵدەسێت بە وردبوونەوەو لێکدانەوەی ئەرکە گشتگیرو سەراپایی ڕەهەندەکانی ژیانی کۆمەڵگەو هەڵسەنگاندنیان وەك: کلتوورو شارەزایی ئەزموونەکان و بارودۆخی ئێستاو داهاتوو، هەروەها ڕێگەچارەی نموونەیی

لەسەر بنەما ئەقڵیەکان دەخاتەڕوو. پەروەردەش ئەرکی وەرگێڕانی ئەو ڕێگەچارە فەلسەفیانەیە بۆ کۆمەڵێك ئاڕاستەو نەریت و شێوازی هەڵسوکەوت لە

کۆمەڵگـەدا، سـەرەڕای هێنانـەدی گۆڕانکـاری لەسـەر ئاسـتی ڕێکخراوە کۆمەڵایەتیەکان بۆئەوەی ببنە پاڵپشتێك بۆ ئەوانەی فەلسەفە دروستی کردوون.

کەواتە لەلایەکەوە فەلسەفە دیاریکەری ئاڕاستەکانی پەروەردەیەو پەروەردەش لەلایەکی دیکەوە ڕاستکەرەوەو خزمەتکەری فەلسـەفەیە، ئەمـەش کارلێـك و ئاوێتەبوونی ئەم دوو لایەنەیە کە دەبنە تەواوکەری یەکترو هەردووکیان وزەو مانا دەبەخشنە یەکتر، بۆیە دەتوانین بڵێین (فەلسەفە بەبێ پەروەردە وشك و بەتاڵە، و پەروەردەش بەبێ فەلسەفە کوێرو نابینایە)

بەهۆی پەیوەندی توندوتۆڵی نێوان فەلـسەفەو پـەروەردەوە لقێکـی پـسپۆڕی بەناوی (فەلسەفەی پەروەردە— فلسفە التربیە) هاتەکایەوە، کـە ئـەم ئەرکانـەی خوارەوە لەخۆ دەگرێت:-

١- تێگەیشتنی پرۆسەی پەروەردە بەشێوەیەکی سەرتاسـەری و گـشتگیرو تـەواو، وە لێکدانـەوەی بنـەما پەروەردەییـەکان لـەژێر تیشکی پرۆسـەی تاقیکردنەوەو ئـەزموونکردنی ئامـانج و سیاسـەتە پەروەردەییـەکان سـەرەڕای دەرکردنی حوکم و بڕیاری گشتیانە.

٢- دیاریکردنی ئـەو مەبەسـت و ئامانجانـەی کـە دەبێـت بهێنرێنـە دی و هەڵبژاردنی هۆو ئامرازی گونجاو، وە ئەزموونکردنی ئەمانەو دانانی ڕێگەچارەی شیاو.

٣- لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی هەڵوێستە فەلسەفیەکان و وەرگێڕانیان بۆ چەند بڕدۆزەو تیۆری پەروەردەییانە، هەروەها وردبوونەوە لە تیۆرە جۆراوجۆرەکان و سازاندن و ڕێکخستنیان لەگەڵ نموونە پەروەردەییەکان، سەرەڕای تاقیکردنەوەی چەمك و ڕاستیەکان و ڕوونکردنەوەی مانایان و مشتومڕ لەسەر کێشەو گرفتەکانی پەروەردەو پەیوەندیان بە بابەتەکانی ترەوە.

٤- دۆزینەوەی (زانین- المعرفە)و کارکردن لەسەر بەردەوامبوونی و گەشەپێدانی و نوێکردنەوەی ئەو زانیاریانەو نیشاندانی شێوازی بەدەستهێنانی، بەپێی ئەو بنەمایەی کە زانین لە پرۆسەی پەروەردەدا پشتی پێ دەبەسترێت، هەروەها ڕێگای بەدەستهێنانی زانین.

٥- لێکۆڵینەوە ئەو بەهایانەی مامۆستایان پێوەی پابەندن و لێکدانەوەی چۆنێتی و جۆری ئەو بەهایانەو پەیوەندیان بە کۆمەڵگاو هۆکارە جیاوازەکانی گۆڕان.

٦- ڕێکخستنی لۆژیکی سایکۆلۆجیانەی بابەت و پرۆگرامی خوێندن، سەرەڕای ناوەڕۆك و هەڵسەنگاندنیان.

٧- فەلسەفەی پەروەردە پێویستیەکی ئێجگار بنەڕەتیە بۆ پەروەردەکاران و ئەنجامدەرانی پرۆسەکە، چونکە وەك ڕۆڵی کەشتیوان و قیبلەنومایە لە کەشتیدا، هەر بەهۆی فەلسەفەی پەروەردەوەیە ئەو کەسانە دەتوانن زانیاریان دەربارەی ماهیەتی کۆمەڵگەو سروشتی تاکە کەسان و دیدو بۆچوونیان سەبارەت بە ژیان

هەبێت. وە ئەم زانیاریانەو چالاکییە پەروەردەییەکان و ئامانجی مەبەست لە پرۆسەکەدا پێکەوە بەجۆرێکی وشیارانە گرێدەدەن و گفتوگۆی ئەرکەکان و بەڵگەنەویستەکان و کاریگەریان لەسەر بەهاکانی پەروەردە دەکەن. لەم بارەیەوە (فینکس) دەڵێت: "فەلسەفەی پەروەردە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوونی ئەو چەمکانە لەخۆ دەگرێت کە دەبنە هۆی گەشەسەندنی پرۆسەکەو پێکهاتەکانی کاری پەروەردەیی و گرێدانەوە یان پێکەوە، هەروەها لێکدانەوەی ئەو مانا پەروەردەییانەیە کە ئەم پرۆسەیە جەختی لەسەر دەکاتەوە ئەگەری بنەڕەتیانەی وەهای دەخاتە بەردەم کە چەمکە پەروەردەییەکانیان لەسەر بەندن، هەروەها کار لەسەر پەرەسەندنی پەیوەندیەکانی نێوان پەروەردەو بوارە بایەخدارەکانی دیکەی ژیانی مرۆڤایەتی دەکات."

سەرەڕای ئەمانەی باسکران فەلسەفەی پەروەردەیی ڕێنیشاندەرو ئاڕاستەکەری بزاوتی پەروەردەییە لە گشتگیری و سەرتاسەرەکانیدا، وە کارلێکی ئەم پرۆسەیە لەگەڵ سیستەمەکانی تری ژیانی کۆمەڵگە ڕووندەکاتەوە ،دەستنیشانکەری ئەوگرفتانەیە دێنەڕێی ئەم پرۆسەیەو هەوڵی چارەسەری گونجاویان بۆ دەدات.

گەر ئەو باسەی پێشوومان ڕوونکردنەوەی پێگەوپایەی فەلسەفە بوویێت لە کایەی پەروەردەییدا، هەروەها ئەو بایەخ و گرنگیەی خستۆتە ڕوو کە فەلسەفە لە بواری فیکریدا (تیۆری)، یاخود جێبەجێکردن (پراکتیزە) هەیەتی بۆ ئاڕاستەکردنی پەروەردە ڕووەو ئامانجەکانی.

ئەوا لە بەشی سێیەمی ئەم کتێبەدا لێکۆڵینەوەو ڕاڤەکردنێکی قووڵتر سەبارەت بە فیکری فەلسەفیانەی لەم کاریگەریانەدا دەخەینە ڕوو، لە چەند تەوەرێکدا کە ئەوانیش:- پەیوەندی ئەم فیکرە بە فەلسەفەی پەروەردەوە، هەروەها چۆنێتی پێکهاتەی ئەم فیکرە لە کلتووری فەلسەفیدا، ئەرکەکانی فەلسەفەی پەروەردەو ئاراستەکردنیان بەرەو سیستمێکی پەروەردەییانەی گشتگیر، هەروەها چالاکییە فێرکاریەکان بە شێوازی فیکرو تیۆریی، یاخود پراکتیزەکردن و چەندەها بابەتی دیکە....

بەرایی:-

پەروەردە وەك بوارێکی پراکتیزەکردن خاوەنی بنەمایەکی فەلسەفیانەیە کە بەشێوەیەکی گشتی لە فەلسەفەوە وەریگرتووە، چونکە فەلسەفە گەر بەو خەسڵەتە ڕەخنەئامێزەو تێڕامانەی ئەرکەکەی بریتی بێت لە دیدێکی گشتی و سەرتاسەری بۆ هەموو ڕەهەندەکانی کۆمەڵگەو هەڵسەنگاندنی زانیاری و شارەزایی و بارودۆخی ئێستاو داهاتوو بێت بەپێی بنەمایەکی ئەقڵانی لۆژیکیانە، ئەوا ئەرکی پەروەردە وەرگێڕانی ئەم فەلسەفەیە دەبێت بۆ:- بەهاکان،خوو نەریتەکان، هەڵسوکەوتەکان و ئاڕاستەکردنیانە، هەر بۆیە وتراوە: (فەلسەفە دایکی پەروەردەیەو پەروەردەش کارخانەی فەلسەفەیە).

پەیوەندیەکی توندوتۆڵ فەلسەفە بە پەروەردەوە گرێدەدات، تەنانەت وەك دوو ڕووی یەك دراوییان لێهاتووە، چونکە ئەرکی فەلسەفە لەوەدا خۆی دەبینێتەوە کە کۆمەڵگە دەگەیەنێتە چەند بیروبۆچوون و بیرۆکەو باوەڕی جۆراوجۆر،لە شێوەی چەند بەڵگەنەویست و حوکمدا دایان دەڕێژێت، بەڵام وەرگێڕانی ئەمانەی باسکران بۆ کۆمەڵێك ئەزموون و شارەزایی و لێزانی و هەڵسوکەوت و بەهاو نەریتەکان، ئەوا ئەمیان ئەرکی سەرشانی پەروەردەیە. لێرەوە فەلسەفە هۆگرو نیاوێزانی پەروەردەیە، ناکرێت لێك جودا بکرێنەوە، چونکە گەر فەلسەفە دیدو بۆچوونی مرۆڤ و کۆمەڵگەکان بێت بۆ ژیان بە هەموو ڕەهەندەکانیەوەو هەر لەرێی ئەمەوە سروشتی مرۆڤ و جۆری شارستانیەکان ڕاڤە دەکرێت، کردەکانی دەسەڵات و

ئابووری و ڕامیاری و بەها... هتد. ئەوا پەروەردە بونیادی تیۆریانەی خۆی لە فەلسەفەوە وەردەگرێت جا چ لەڕووی سیاسەتی پەروەردەییانە، یاخود ئامانج و نەخشەو شێوازەکانیەوە بێت، یا لەو ڕوانگەوە بێت کە تا چەند ئەو دیدو بۆچوونە فەلسەفیانە پراکتیزە بکرێن لە ژیانی ڕاستەقینەی نەوە نوێکان و هەموو تاکێکی کۆمەڵگا، سەرەڕای گواستنەوەی شارەزایی و لێزانییەکان بۆ نەوەی نوێ.

هەر لەبەر ئەم هۆیانە بوو فەلسەفەی پەروەردە وەك زانستێك و پسپۆڕێتییەکی مۆدێرن دەرکەوت ئەرکەکانیشی بریتین لە: ئاڕاستەکردنی سیستمی پەروەردەیی بەشێوەیەکی گشتی وسەرتاسەری، دیاریکەری ئامانج و مەبەستە پەروەردەییەکانە، هەڵبژاردنی هۆو ئامرازی گونجاوە، ئەمانەش پێکەوە لەژێر تیشکی تیۆرەو بیردۆزە پەروەردەییەکان ئەزموون دەکات، وە گفتوگۆو لێکۆڵینەوە لەسەر کێشە گەورەکانی بواری پەروەردە ئەنجام دەدات، مانا و چەمکەکانی ئەم پرۆسەیە ڕوون دەکاتەوەو زانینی نوێ و ڕێگاکانی بەردەوامبوونی و بەدەستهێنان و تازەبوونەوەی ئەم زانستانە لەئەستۆ دەگرێت، بەهاکانی مامۆستاو خوێندکاران ڕاڤە دەکات و گرنگی بە شتگەلێك دەدات کە پەیوەستن بە نەخشەدانانی پرۆگرام و بابەتەکانی خوێندن. سەراپای ئەم کارانەش بەپێی پلانێکی هەمەلایەنانە ئەنجام دەدات بۆ هێنانەدی ئامانجە پەروەردەییەکان و ئەو مەبەستە فەلسەفیانەی کۆمەڵگا لە شێوازی ژیانی خۆیدا هەڵیان دەبژێرێت.

## یەکەم: ناوەڕۆکی فەلسەفە و ماناکەی:-

بەدرێژایی مێژوو فەلسەفە یەکێک بووە لەو چەمکانەی زۆری لەسەر وتراوەو مشت ومڕێکی بەردەوامی دەربارە کراوە، چونکە جێ سەرنج و بایەخی زاناو بیریاران و هەموو ئەو کەسانەی پەیوەندیان بە لقێك لە لقەکانی زانین و هزرەوە بێت، فەلسەفە ببووە تارماییەك باڵی بەسەر زۆربەی زانستەکاندا کێشابوو، تەنانەت ئەم جۆرە بیرکردنەوەیە تا ماوەیەکی کەم بەر لە ئێستا زاڵ بووە. بەو مانایەی هەر کەسێك سەرقاڵی لقێك لە لقەکانی زانست و زانین بووبێت ئەوا ناچار دەبوو بایەخ بە فەلسەفە بدات و شوێنکەوتەی میتۆدێك لە میتۆدەکانی فەلسەفە بێت لەپێناو داڕشتنی دیدو بۆچوونەکانی سەبارەت بەو زانستە، بۆیە هەمیشە دەرەنجامی لێکدانەوە زانستیەکان بە هزرێکی فەلسەفیانە زاخاو درابوون.

ئەمەش بەو مانایە نیە کە فەلسەفە تەنها موڵك و قۆرخکراوی زاناو بیریاران بووبێت، بەڵکو بەو پێیەی ئەمان سەرقاڵی زانست و زانیاریەکانن، ئەوا دەبوو فەلسەفە بوارێك لە بوارە سەرەکیەکانی کارە زانستیەکانیان بوایە، ئەمە لەلایەك، وە لەلایەکی دیکەوە تا ئاستێکی قووڵ ڕۆبچوونایەتە نێو فەلسەفەی زانستەکەوە، هەرچەند لەم سەردەمەدا زانستەکان لەم باڵادەستیەی فەلسەفە ڕەها بوون، بەڵام هەنووکە فەلسەفەی زانست وەك دیدێکی قوڵ و فراوان لە هەر

بوارێکی زانستیدا لەپشت لێکدانەوەو ڕاڤەکردن و ئەنجامگیریەکان بوونی هەیە، ئەمیش لەپێناو گەشتن بە سەرتاسەرترین و بالآترین یاساکانی زانست، واتا ئەو یاسایانەی کە فەرمانڕەوایی ئاقارو ئاڕاستەی دیاردەکان و پێشبینیان دەکات، بەڵام دەبێت ئەوەش بزانرێت هەمووان چ وەك تاکە کەس، یاخود کۆمەڵ فەلسەفە بوونێکی هەمیشەیی و زیندووی هەیە لامان، وە بێئەوەی هەست بکەین لەنێو شەپۆلەکانی فەلسەفەدا قاڵبووین و بێ ئاگاییانە وردەکاریەکانی فەلسەفە تاوتوێ دەکەین. تەنانەت هەندێك لە کەسەکان بەجۆرێك خۆ دەردەخەن کە بە فەلسەفە ناڕەحەت و پەست دەبن، بەهیچ جۆرێك نایانەوێت گوێبیستی وشەی فەلسەفە بن، ئەوا بێ ئاگایانە بڕیارێکی لەم جۆرە خۆیەخۆ خودی فەلسەفە دەگەیەنێت !!!.

بۆ نزیکبوونەوە لە مانای فەلسەفەو ساکارکردنی دەتوانرێت دەربڕینێکی تر دابنرێت ئەویش (دیدو بۆچوون)ە. ئاشکرایە هەریەك لە ئێمە سەبارەت بە بیرکردنەوەی، یاخود حوکمدانی بەسەر شتەکاندا، وە یا ئاڕاستەی بیرکردنەوەو بەهاو شێوازەکانی ژیانی دیدو بۆچوونێکی تایبەت بە خۆی هەیە.

بێگومان هەر یەکێك لە ئێمە بە دەیان پرسیار بە زیهنیدا تێدەپەڕێت سەبارەت بە دەوروبەر، هەموو هێزو توانای دەروونی و هزری خۆی دەخاتەکار بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بۆ گەشتن بە بڕوای تەواوو هەڵسوکەوتێك جێگەی ڕەزامەندی خۆی بێت، بۆ نموونە گەر کەسێك بیەوێت پەیوەندی هاوڕێیەتی لەگەڵ

کەسێکی تردا ببەستێت، ئەوا پێشتر چەندین پرسیار سەبارەت بە سروشت و خووی ئەو کەسە لە خۆی دەکات وەك:- ئایا دەبێت بەهاکانی ئەو کەسە چی بن؟، وە یا چۆن بڕیارێك سەبارەت بە دیاردەو ڕووداوەکان دەدات؟ و چەندین پرسیاری دیکەی لەم جۆرە،پاشان وەڵامەکانی خۆی تاووتوێ دەکات و هەڵیاندەسەنگێنێت تا دەگاتە ئەو دەرەنجام و لێکدانەوەی خۆی پێی قایلە...

نموونەیەکی دیکە:- کاتێك سەرکردەیەك دەیەوێت بچێتە جەنگێکەوە، ئەوا پێش زانین و زانیاری دەربارەی هێزەکانی خۆی و پێداویستی و کەلوپەلە جەنگیەکان دەبێت فەلسەفەی دوژمنەکەی سەبارەت بە جەنگ بزانێت، بەهەمان شێواز بازرگان، پیشەوەر، جووتیار،... هەموو ئەمانە لێکدەدەنەوەو بیردەکەنەوەو ئەنجامگیری دەکەن پێش دەستکردن بە کارەکانیان... ئەمە مانای وایە هەر کەسێك دیدو بۆچوونی سەبارەت بە کارەکەی و وەڵامی ئەم پرسیارانەش یارمەتیدەری دەبن لە هەڵسوکەت و کارو بەرهەمدا لەپێناو ژیانێکی خۆشگوزەراندا، بە چاوپۆشین لەوەی پلەی بیرکردنەوەو لێکدانەوە لە چ ئاستێکدان، با کەسەکە خاوەن بیرکردنەوەیەکی کرچ و کاڵ بێت و توانا هزرییەکانی سنوورداریش بن، ئەوا ئەم کارە واتە لێکدانەوەو ڕاڤەکردن و ئەنجامگیری و هەڵسەنگاندنە ئەنجام دەدات.

مامۆستا ئەو کەسەیە زیاتر لە هەموومان پێویستی بەم دیدو بۆچوونە هەیە ئەویش بۆ زانینی سروشتی کارەکەی و ئامانج و چۆنێتی دروستکردنی کاریگەری لەسەر ئەو کەسانەی پەروەردەیان دەکات و وانەیان پێدەڵێتەوە، تا بۆچوونێکی شیاو دروست بێت.

ڕەنگە ئێمە ئەو پرسیارانەمان کردبێت: بۆچی و چۆن فلان مامۆستا یا بەڕێوەبەر بەجۆرێکی دیکە هەڵسوکەت دەکات و بۆچی بیرکردنەوەی جیاوازە؟ یاخود دەپرسین هۆی چییە ئەم مامۆستا یان بەڕێوەبەرە لە کارەکەیدا سەرکەوتووترە لەچاو هەمان مامۆستا یان بەڕێوەبەر لە کاتێکدا هەمان بارودۆخ و پلەو توانایان هەیە؟

وا دەردەکەوێت ئەم مامۆستایە سەرکەوتووەو دیدو بۆچوونێکی ڕێك و لۆژیکیانەی بەرامبەر بە ژیان،خەڵك، پەروەردە هەیە، کە ئەمەش خۆی لەخۆیدا فەلسەفەیەکە پشت بە وشیاری و تێگەشتنی ئامانجەکانی ژیان و کۆمەڵگە دەبەستێت، چونکە ئەقڵێکی کراوەو سەردەمیانە هەموو ئەرك و لێپرسراوێتیەکانی ئەنجام دەدات، بۆ نموونە نەخشەو پلان دادەنێت، چاودێری دەکات، هەڵدەستێت بە کۆکردنەوەی زانیاری و ڕاستیەکان، لە پاشاندا ڕەخنە لە هەموو ئەو گرفتانە دەگرێت کە دەبنە کۆسپ لەبەردەم قوتابخانەکەیدا،لێکۆڵینەوە ئەنجام دەدات، هەمیشە خاوەن پەیوەندیەکی ڕاست و تەندروستە لەگەڵ هاوکارانی مامۆستایان و خوێندکارانیدا، بوار دەداتە کەسانی دیکە ڕاو

سەرنجەکانیان دەربڕن و بەشدارین لـە دابەشـکردنی ئـەرك و لێپرسـراوێتییەکان، سەرەڕای چەند هەڵسوکەوت و کرداری تر کە ڕێخۆشکەر دەبـن لـە پێکهێنـانی کەسایەتییەکی بەڕێزو سەرکەتوو، کەواتە ئەمانە بوون لەپشت سەرکەوتوویی فلان ماموستا، یاخود بەڕێوەبەر.

کەواتە مامۆستای سـەرکەوتوو ئـەو مامۆسـتایەیە دیـدو بۆچـوونی پـشت ئەستوور بە ڕاستی بابەتیانـەوە زانـست و زانیـاری و ئـەزموون و شـارەزایی و هەڵسوکەوت لە کردارەکانی بەپێی چەند بەهایەکی واقعیانە دەبات بەڕێوە، لـە دەرەنجامدا دەتوانین بڵێین ئەم دیدو بۆچوونە بریتییە لە فەلسەفەی تایبەت بەم تاکە کەسەوە.

جگە لەمەش فەلسەفەیەکە گشتی هەیە کە دەربـڕی ئـەو دیـدو بۆچـوونەی کۆمەڵەو بەدرێژایی مێژوو وەك بەڵگەنەویستێکی ئامادە کەڵەکە بـووە، لـەڕێی چەمك و ڕاستییە چەسپیوەکانەوە کۆمـەڵ بـاوەڕی پێـی هێنـاوە، ئـەو دیـدو بۆچوونە فەلسەفیانەی کۆمەڵگە لەخۆ دەگرن کە پرۆسەی هەڵسەنگاندنیان پشت بە چەندەها پێوەری:- زانین ، ئاکاری (اخلاقی)، کۆمەڵایەتی دەبەستن، ئەمانیش بەسەریەکەوە کۆمـەڵێك ڕای گشتی پێکدێنن سەبارەت بە:- جیهان و سروشت و مرۆڤ و کۆمـەڵگاو زانین و بەهاکان و... هتد.

لەگـەڵ ئـەم سـاکارکردنەوەیەی مانـاو نـاوەڕۆکی فەلـسەفەدا، پێناسـێکی سەرتاسەری و گشتگیر بۆ فەلسەفە بە ئەستەم دەبینرێتەوە، چونکە هەریەك لە

پێناسەکانی مۆرکی ڕێبازێك، یاخود ڕێچکەیەکی فەلسەفی تایبەت وەردەگرێت، یا پێناس و بۆچوونی تاکە کەسی فەیلەسوفێك وەردەگرێت نەك پێناس و بۆچوونی سەرتاسەر. تەنانەت گەر بڵێین چەندەها خاڵی بەیەکگەیشتن و لێکچوو لەنێوان ڕێبازە فەلسەفیەکاندا هەیەو هەڵقوڵاوی بابەتی فەلسەفەو ئەرکەکانیان ئەگەری ئەوە بدەنە دەست کە بتوانین لەسەر پێناسەیەکی فەلسەفیانە کۆك و تەبابین، ئەوا ئەمە بۆ خۆی کارێکی سەخت و دژوارەو لێرەدا ناتوانین ڕاستی بپێکین، چونکە هەریەکێك لەو فەلسەفانە شێوازێکن لە شێوازەکانی فەلسەفە، وە هەر فەیلەسوفێکیش فەلسەفاندن لە دیدو بۆچوونی تایبەتی خۆیەوە دەکات.

ئێمە هەندێك لەو پێناسانەی فەلسەفە دەخەینەڕوو، ئامانجمان دەرخستنی دیدگەلێکی جیاوازو دووری سەرەتاکانی فەلسەفەیە لە ڕێبازە جیاوازەکانی فەلسەفە، هەروەها مەبەستمانە خوێنەریش بەرەو ئاراستەی ئەو شەپۆلە فەلسەفیانە بەرین کە هەمیشە لە هەڵچوون و بەرزبوونەوەدان، یاخود لە خامۆشبووندان.

فەلسەفەی پەروەردە لە هەوڵی ڕەخساندنی ژینگەیەکی پەروەدەییانەی دەستەبژێرە. باشترین هۆکارو شێواز بۆ زانیاری و شارەزایی پەیداکردن لە فەلسەفەدا خۆهاویشتنە نێو شەپۆلەکانیەتی و بەشداریکردنە لەو جەنگە گەرم وپڕ خرۆشانەی فەلسەفەدا، بۆیە پێویستە خوێنەر، یا لێکۆڵەرەوەی فەلسەفە زۆر بەوردی و وریاییەوە مامەڵەی لەگەڵدا بکات.

ئەم چەند دێڕەش ڕوونکردنەوەیەکی خێرای وشەی فەلسەفەیە لەڕووی لێکدانەوەی زمانەوانی و زاراوەیی (المعنى اللغوی و الاصطلاحی) وشەکەو مێژوویەکی کورتی سەرهەڵدانی:

وشەی فەلسەفە (philosophy) لە بنەڕەتدا سەرچاوەکەی یۆنانی کۆنە (فیساگۆرس) لە سەدەی شەشەمی پێش زایینندا یەکەمین کەسە ئەم وشەیەی بەکارهێناوە، هەرچەندە کۆمەڵێك وای بۆ دەچن کە (سوقرات) بێت. وشەکە لە دوو بڕگە پێکهاتووە (phil)، یاخود (philein) واتا خۆشەویستی، (sophia)، یا (sophy) واتا دانایی، هەردوو بڕگەکەش پێکەوە مانای: خۆشەویستیی دانایی دەگەیەنن نەك بانگەشە بۆ دانایی. تا ئاماژەیەك بێت بۆ گەشتن بە ڕاستی لەڕێگەی هەوڵدان و بەدواچوونی بەردەوام و تێڕامان و لێکدانەوەی شتگەل و مەسەلەکان بە دیوە ڕاستەکەیدا. دانایی پێنج بنەمای هەیە کە ئەمانەن:

أ- گشتگیری و تێڕوانین هەر لە بەش و پارچەکانەوە تا تەواوی شتەکان (سەراسەرییەکان)

ب- بەرفراوانی تێڕوانین و سەرنج لە سنووری تاکە کەسییەوە تا سنورە بەرفراوانەکان.

ت- زرنگی و کارامەیی هەر لە بەهاو نرخی ڕووکەشییەوە تا بەهای جەوهەری.

پ-	تێڕامان و لێکدانەوەی ئەو چەمك و بیروڕایانەی کە شیکردنەوەی دیاردە ڕووکەشیەکانە هەر لە مەودای گشتی بینراودا تا مەودای نەبینراو.

ج-	پراکتیزەکردن سەرەتا لەتوانای پراکتیزەکردنی زانینەوە تا کۆتایی بەباشی پیادەکردنی و سودبینین لەو زانینە.

وشەی (philophier) واتا فەیلەسوف، بۆ ئامـاژە بـەو کەسەی خۆشەویستی بۆ دانایی هەبووەو لە هەوڵی گەڕاندا بووە بەدوای حەقیقەتدا، دەوترا شتەکەی فەلسەفاند واتا لێکدانەوەی فەلسەفیانەی بۆ کرد، بەمانای گەشتن بە حوکمێکی ئەقڵ ئامێزو بەڵگەو بەهانەی ڕوون و ئاشکرا. ئەم مانا زمانەوانیەی فەیلەسوفانی یۆنان خستبوویانە ڕوو لەنێوەندە فکری و زانستیەکاندا پەسەندکرابوو، وە هیچ ناکۆکی یا ناتەبایی لەم ڕووەوە نەبووە، بەڵام پێناسەی زاراوەیی (التعریف الاصطلاحی) پێشترو بە ئێستاشەوە جێگەی ناکۆکی و جیاوازیەکی زۆرەوە بۆتە ئاڵۆزترین چەمکێك زۆرترین مشتومڕی لەخۆ گرتبێت، ئەمەش ئاماژەیە کە بابەتێکی فرە ڕەهەندو دەوڵەمەندە، چونکە وەڵامدەرەوەی دیدی مرۆڤ و بۆچوونی بۆ ژیان و جیهانە، هەروەها وەڵامدەرەوەی شێوازی ژیان و ئەوەیە کە مرۆڤ لە ژیانیدا دەیەوێت بیهێنێتەدی. ئەمەش لەوە زیاتر دەگەیەنێت فەلسەفە ماناو سودی لەدەست دابێت وەك کۆمەڵێك وای بۆ دەچن.

ئێستاش هەندێک لە پێناسەکانی فەلسەفە دەخەینەڕوو تا هەڵوێستەیەک

لەسەر سروشتی فەلسەفەو لایەنە فیکریەکانی کەسانی بەشداربوو لە بونیادو

ڕەگداکوتانی فەلسەفە ڕوونکەینەوە، لەو پێناسانەش:-

- (ئیفلاتون) بە یەکەمین کەس دادەنرێت کە ڕەگ و ڕیشەی فەلسەفەی بەرفراوان کرد، لای ئەم فەلسەفە:- (بەدەستهێنانی زانیاریە). فەیلەسوفیش بە بۆچوونی ئەم:- (ئەو کەسەیە عەودالّی گەشتن بە زانینی مەسەلە ئەزەلیەکانەو زانینی دەربارەی ڕاستی شتەکانە).

- (ئەرستۆ) چەند پێناسەیەکی بۆ فەلسەفە کردووە گرنگترینیان:- (زانستی هۆکارە دوورەکان و بنەما یەکەمینەکانە، وە یا زانینی بوونی پەتیە (الوجود المجرد) لە هەر دیاریکردنێک، وە یا زانینی خودی ماهیەتە، یاخود زانینی ماهیەتی هەموو بوونەوەرە).

- (کانت) بەجۆرە پێناسەی فەلسەفە دەکات:- (تیۆرێکە دەربارەی لەتوانادا بوونە، وە یا سنوری ڕەهای هەموو جۆرەکانی زانینی لەتوانادا بووندایە).

- (کندی) یەکەمین فەیلەسوفی ئیسلام (٢٤٦ ک) دەڵێت: "زانستی شتەکانە بە ڕاستیەکانەوە بەو ئەندازەیەی مرۆڤ توانای بەسەردا بکێشێت، چونکە ئامانجی فەیلەسوف پێکانی ڕاستی یەکەمینە، یاخود هەموو ڕاستی، پاشان

پێناسەی فەلسەفە دەکات و دەڵێت: "زانستی هەموو بوونەوەرە بەوەی کە بوونیان هەبێت، لقەکانیشی: دانایی خوداوەند، سروشت، ژمێرە، لۆژیکە."

- هەموو ئەو لێکۆڵینەوانە دەگرێتەوە کە پەیوەستن بە ئەقلی جیاوازو شایستە لە بابەتەکانی زانیندا، چ بە لێکۆڵینەوەی ڕەخنەییانەی ئەو بابەتە ڕاستەوخۆیانە بێت کە سەبارەت بە زانستن، یاخود ئەو لێکۆڵینەوە ئەقلیانەی بۆ حوکمە بەهادارەکانە، کە لە توێی زانستە پێوانەییەکاندان (ئاکار- ئیستاتیکا - لۆژیك)، (الاخلاق- الجمال-المنطق).
- زانستی سەخترین شتەکانە، دووردەسترین شتگەلێك لەخۆ دەگرێت کە زانینی هەستی مرۆیی پێی نەگات.
- جۆرێکە لە زانینی گشتی هەموو بەشە جیاوازەکان دەگرێتەوە.
- دانایی ژیانە لەژێر تیشکی ئەوەی ئەقڵ (ژیری) پەی پێ دەبات.
- حەزکردن لە ڕوون و ئاشکرایی و لێکدانەوەی ئاماتجدارە کە پەیوەستن بە زانستە دانراوەکانەوە (العلوم الوضعیة).
- میتۆدی دەرخستنی بنەماکان و ئەگەرە سەرەتاییەکانە کە هەموو زانستەکانیان لەسەر بەندە.
- دیدو بۆچوونێکە سەبارەت بە جیهان پشت بە چەند بنەمایەکی ئاکاری و سروشتی دەبەستێت.

لەو پێناسانەدا تێبینی ئەوە دەکرێت تەواوکەری یەکتر بن و ڕوونکردنـەوەی مانای فەلسەفە بن، هەرچەندە هەندێکیان وا دێنە پێش چاو لەگەڵ یەکـدی دژو ناتەبا بن، بەڵام لە دواجاردا بە دیدێکی وردبینانە هەست دەکەین کۆکن لەسـەر بابەتەکانی فەلسەفەو لێکدانەوەکانی، هەروەها سەبارەت بە ئەرکەکانیشی، بەڵام لە دوا مەبستی فەلسەفەدا، یاخود ئەو ڕێگاو هۆکارانە دەگەنە بەدیهێنانی دوا ئامانجی فەلسەفە ناتەباو ناسازن بە یەکدی.

## دووەم:- بابەتەکانی فەلسەفە:-

١. بابەتە گەردوونیەکان (الکونیات):- واتا (کۆسمۆلۆجیا **cosmologia**) ئەمیش لایەنێکی گرنگی فەلسـەفەیە، لێکۆڵینەوەیـە سـەبارەت بـە پرسـیارە سەرەکیەکانی فەلسەفە وەك:- جیهان چیە؟ چۆن دەستی پێکـرد؟ کـێ هێنایـە بوون؟ چۆن بەرەوپێش چوو؟ بۆچی جیهان هەیە؟ ئەی سروشـتی کـات و شـوێن چیە؟ سروشتی ئەمر چی بێت؟ لەناوچوون چـیە ؟... هتـد. چـەندین پرسـیاری دیکەش کە سەرەتاکانی فەلسەفەیان دارشتووە، هەرچەند ئێستا گەلێك زانستی نوێ هەیە لە هەوڵی وەڵامدانەوەی ئـەم پرسـیارانەدایە، بـەڵام تـا هەنووکـەش فەیلەسوفان لەرێی ڕامانە ئەقلیەکانـەوەو ڕاڤـەکردنی لۆژیکیانـە وەڵامـی ئـەم پرسیارانە دەدەنەوە بێئەوەی فەلسەفە دوا وەڵامی خۆی بخاتە ڕوو.

٢. زانین (المعرفه) واتا ئەپستمۆلۆژیا (apistmology):-

ئەمیش بریتیە لە تیۆرو بیردۆزی زانین، یاخود ئەو زانستەی ئامانجی دۆزینەوەی ئەو شتانەیە کە ناوەڕۆکی پرۆسەی زانینن، ئەم پرسیارانە لەخۆ دەگرێت: ئایا دەتوانرێت... ؟ سەرچاوەکانی زانین چین؟ سنورەکانیان کامانەن؟ ئایا پلەی یەقین چیە؟ ئەی ڕادەی گۆڕانی ئەو یەقینە چیە؟ جیاوازی چیە لەنێوان زانینەکانی: ئەقلی، ئەزموونی، واقعی، پەیبپێبراوەکان؟ ئەی چۆن ئەم زانیاریانە بەدەست دەهێنرێن؟

٣. بوون (الوجود) ontology:-

ئەو زانستەیە لێکۆڵینەوە دەربارەی بوون دەکات پرسیارگەلێکی لەم جۆرە لەخۆدەگرێت : بوون الوجود ماتریالە یا ئایدیا ؟ یاخود تێکەڵەیەکە لەم دووە؟ ئایا بوون لەچەند پێکهاتەیەك دروستبوە یا تەنها یەك پێکهاتەیە ؟ بوون و نەبوون(الوجود و العدم ) چی دەگەیەنێت؟

تا چەند زانست هەوڵی وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە بدات ئەوا فەلسەفە دورتر دەڕوات و پرسیاری نوێ دەوروژێنێت بۆ ئەوەی زانست وەڵامیان بداتەوە .

٤. بەهاکان (القیم) ئەکسیۆلۆژیا axiolgy :-

ئەم بەشەی فەلسەفە لێکۆڵینەوەیە دەربارەی سەرچاوەکانی بەهاو سروشت و جۆرەکانی، هەروەها توانای ئەم بەهایانە لە ئاڕاستەکردنی هەڵسوکەوتی مرۆیدا لەسەروو هەموویشیانەوە بەهاکانی: حەقیقەت، چاکە، جوانناسی (ئیستاتیکا).

بەهاکانی حەقیقەت ڕاڤەکردنیان ئەرکی لۆژیکە لەڕێی یاساو ڕێساکانی هزرەوە، بەهاکانی چاکە زانستی ڕەوشت (ئاکاری) لێکۆڵینەوەی لەسەر دەکات ئەویش لەڕێی ماناکانی چاکەو خراپە، بەهاکانی جوانناسی زانستی ئیستاتیکا لەسەری دەکۆڵێتەوە، ئەم زانستەش بە زانستە پێوانەییەکان ناودەبرێت، واتا ئەو زانستەی کە دەبێت: بیرکردنەوەی دروست و، هەڵسەکەوتی چاك و، شتگەلێکی جوان بگەیەنێت بەبێ ڕەچاوکردنی بارودۆخ و کۆت و بەندەکانی واقع..

٥. میتافیزیك (سەروو سروشت) metaphsics:-

ئەمیش لێکۆڵینەوەو گەڕانە بەشوێن واقعی ڕەهادا، واتا گەڕان بۆ ئەو (بوون )ەی کە هەیە، هەروەها گەردوون و ئەو بنەمایانەی لە گەردووندا هەن (باڵایی، شوێن، کات، وزە، جوڵە،...) ئامانجی گەیشتنە بە دیدێکی گشتی و سەرتاسەری دەربارەی ژیان و جیهان،

هەنێك جاریش میتافیزیك بە بابەتی گەردوونیەکان ناودەبرێت، کۆمەڵێکی دی جگە لەم بابەتانە (زانیین – المعرفه)شی دەخەنەسەر.

## سێیەم: پەیوەندی نێوان فەلسەفەو پەروەردە:-

فەلسەفەو پەروەردە دوو ڕووی یەك دراون، یەکەمیان سنورەکانی دیدە بۆ ژیان، یاخود فەلسەفەی ژیانە. دووەمیش واتە پەروەردە چۆنیەتی پڕاکتیزەکردنی ئەو دیدەیە لە کاروبارەکانی ژیانی مرۆڤدا، هەر لێرەوەیە تۆکمەیی پەیوەندی نێوان فەلسەفەو پەروەردە دەردەکەوێت، چونکە گەر فەلسەفە هزر بێت، ئەوا پەروەردە پڕاکتیزەکردنی ئەو هزرەیە بەهیچ جۆرێکیش ناکرێت هزر لە پڕاکتیك دابڕێت، چونکە هەر هزرە ئاڕاستەی پڕاکتیزەکردن دەکات، ڕێڕەو و ئامانجەکانی ڕوون دەکاتەوە، پڕاکتیکیش تاقیگەی هزرەو دەوڵەمەندیشی دەکات.

گەر فەلسەفە پەیوەندیەکی تۆکمەی بە ژیانی هەموو کۆمەڵگەیەکەوە هەبێت، هیچ کۆمەڵگەیەکیش بێ فەلسەفە نەبێت (کە نوێنەرایەتی دیدو بۆچوونەکانی دەکات)، ئەوا فەلسەفە بوون و سروشتی خۆی لەم دیدو بۆچوونەوە دەستبەر دەکات، گەر پەروەردەش ئامڕازی شێوازی ژیانی کۆمەڵگە بێت، هۆکارێك بێت بۆ دامەزراندنی ئەو بەردەوامی و گۆڕانکاریانەی ژیانی کۆمەڵایەتی بە هەموو ڕەهەندەکانیەوە، ئەوا بوونی خۆی (واتا پەروەردە) لە فەلسەفەوە وەردەگرێت، بۆ نموونە کاتێك پەروەردە باس لە گشتیترین کێشەکانی مرۆڤ و کۆمەڵگاو هیواو ئاواتی بێ سنور دەکات، ئەوا دەبێت کۆمەڵگە

فەلسەفەیەکی هەبێت بۆ داڕشتنەوەی ئەو جۆرە ژیانە مەدەنیەتەی کۆمەڵگە پێویستیەتی، یاخود جۆری کەسەکان و خەسڵەتەکانیان، بە باشترین شێوازێك کە کۆمەڵگا دەیخوازێت.

پاشان فەلسەفە دەتوانێت سود لە ئەزموونەکانی ڕابردوو ببینێت و چارەسەری گرفتەکانی ئێستای پێ بکات، ئەو توانایەش دەداتە فەلسەفەی پەروەردەیی چالاکیەکانی پەروەردە بەجۆرێکی گشتی و سەرتاسەری ئاراستە بکات، یەکێتی ناوەکی و دوا مەبەستی بپارێزێت هەربۆیە فەلسەفە ئەو تێڕوانین و بۆچوونە هزریانە دەخاتە ڕوو: وەك ئەوەی چ جۆرێك بن ؟ یا چەند پێویستن لە ژیانی مرۆڤ و کۆمەڵگادا؟ چ ئێستا یاخود سبەی، ئەمەش ئەو توانایە دەداتە پەروەردە گۆڕانکاریەك بهێنێتەدی کە پێویستی ئێستاو داهاتووە، لێرەوە تۆکمەیی پەیوەندی نێوان فەلسەفەو پەروەردە ڕووندەبێتەوە، بەڵکو تەنانەت هەموو مەسەلە پەروەردەییەکان هەمان مەسەلەی فەلسەفین، بۆیە لە کۆنەوە گوتراوە فەلسەفە بێ پەروەردە بەتاڵەو پەروەردەش بێ فەلسەفە نابینایە.

لەم بارەیەوە (هربرت سبنسەر) دەڵێت: "پەروەردەی ڕاستەقینە لەڕێی فەلسەفەیەکی ڕاستەقینەوە نەبێت نابێتە پرۆسەیەك". (جۆن دیوی) جەخت لەسەر ئاڵوگۆڕکردنی پەیوەندیەکانی فەلسەفەو پەروەردە دەکاتەوە، چونکە گەر فەلسەفە ڕێنیشاندەری کاری پەروەردەییانەو هۆکاری گۆڕانی بێت، ئەوا پەروەردە لای خۆیەوە ئەو فەلسەفەیە تاقی دەکاتەوەو یارمەتیدەری دەبێت بۆ

هەڵسەنگاندنی گرفتەکانی پراکتیزەکردنی پەروەردەییانە دەرەنجامەکەی ڕاستکردنەوەی فەلسەفەیە بە ئەندازەی لێکچوون و هاو جووتبوونی لەگەڵ واقعدا، بۆیە لقێکی نوێ بەناوی (فەلسەفەی پەروەردە) هاتە ئارا کە بۆتە پردێکی نێوان فەلسەفەو پەروەردە، تەواوکاریی مەرجەکانی گرێدان و بەستنەوەی ئەم دوو کایەیە دەکات.

## چوارەم : فەلسەفەی پەروەردە

بریتیە لە پرۆسەی پراکتیزەکردنی دیدو میتۆدی فەلسەفیانە لە بواری پەروەردەدا، چونکە هەڵدەستێت بە دیاریکردنی ڕێچکەی پرۆسە پەروەردەییەکان و ڕێکخستن و ڕەخنەگرتن و ڕاستکردنەوە یان، لەژێر ڕۆشنایی کێشەو گرفتە ڕۆشنبیرییەکان و ململانێی نێوانیان بەو مەبەستەی پێکەوە گونجان و ڕێکخستنی ناوەکیانەی پەروەردەیی و سەرجەم دەزگا کۆمەڵایەتیەکانی دیکە بێت.

فەلسەفەی پەروەردە ئەرکی گەڕانە بەشوێن چەمکگەلی ئامادەیی تاکە کس لەنێو دیاردە جیاوازەکانی پرۆسەی پەروەردەیی.

لەرێی پلانێکی تەواو دارێژراوی گشتگیردا، ڕوونکردنەوەی ئەو مانایانە لەخۆ دەگرێت کە گۆڕانکاریە پەروەردەییەکانیان لەسەر بەندە، سەرەڕای خستنەڕووی کۆمەڵە ئەگەرێك کە چەمکە پەروەردەییەکان پشتی پێ دەبەستن،

هەروەها ئەركی بەرەوپێشبردنی پەیوەندییەكانی پەروەردە لەگەڵ سەرجەم بوارەكانی ژیانی مرۆڤایەتیدا لەئەستۆ دەگرێت.

دەتوانین بەشێوەیەكی ڕوون و ئاشكراتر دەربارەی فەلسەفەی پەروەردە بڵێین: ئەم پرۆسەیە بریتییە لە سەرپەرشتیكردنی میتۆدیانە بۆ دوارۆژی پەروەردەیی لەو پەیوەندییەی كە بەشێوەیەكی گشتی بە داهاتووی كۆمەڵگای دەبەستێتەوە، ئەمەش لەڕێی ئەو دیدە ڕەخنەئامێزە سەرتاسەرییەی واقعی پەروەردەییانەی ئێستاو دەوروبەری ئەم واقعەو چ شتگەلێك دەوریان داوەو دەگاتە چ دەرەنجامێك؟

بەجۆرەش دەتوانرێت پێناسەی فەلسەفەی پەروەردە بكرێت: بریتییە لەو هەوڵە بەمەبەستەی پراكتیزەكردنی هزری فەلسەفیانە تا لە بواری پەروەردەییدا جێبەجێ بكرێن، یاخود پراكتیزەكردنی ئەو دیدو بۆچوونە فەلسەفییە گشتیەی كە پێكهاتەكانی پەروەردەو فێركردنیان پێكدەهێنێت، گەڕانە بەشوێن زانین و بەهاكان، وە ڕەخنەگرتنە لەو ئەگەرو سەلمێنراوانەی كە بەپێی گۆڕانكارییەكانی كۆمەڵ و ڕێكخستن و ڕاستكردنەوەی پرۆسەكانی پەروەردە ئاراستە دەكەن.

بەمانایەكی تر فەلسەفەی پەروەردە واتا پراكتیزەكردنی ئەو بیروڕاو بۆچوونانەی كە فەلسەفەی گشتی پەیڕەویان دەكات لە كاتی چارەسەری كێشەكاندا، سەرەڕای ئاراستەكردنی سەرجەم هەوڵە پەروەردەییەكان و پرۆسەكانی فێركردن بەرەو دوا مەبەست. یەكێك لە پەروەردەكارانی فەرەنسی

دەڵێت: "مەبەستم لە فەلسەفەی پەروەردە ئەو هەوێنەیە کە پێویستە پارێزگاری لە پەروەردەو جیهان و مێژوو بکات، ئەو بەڕێوەبردنە تونلوتۆڵەی کە سەربەرزانە ڕاوەستاوە بۆ وەڵامدانەوەی پرسیارو ڕووبەڕووە مەزنەکانی سەردەم".

زیادەڕەوی نیە گەر بوترێت: بنەڕەتی فەلسەفیانەی پەروەردە سەرەتای دەسپێکی هەموو کارێکی پەروەردەییانەی سەرکەوتووە،چونکە چوارچێوەیەکی هزریی سەرتاسەرییە کە تیۆرەکان بەرەو پراکتیک دەبات، وە فەرمانڕەوایی کارەکان دەکات بە دیاریکردنی ئامانج و دوا مەبەستەکانی پەروەردە دەستپێدەکات. لە سەرەتاوە پرسیارگەلێکی لەم جۆرە دەوروژێنێت: بۆچی پرۆسەی پەروەردەو فێرکردن ئەنجام دەدەین؟ کە ئەم پرسیارەش یەکەمین هەنگاوی کاری پەروەردەییانە دەگەیەنێت. وەڵامدەرەوەی ئەم پرسیارەش فەلسەفەی پەروەردەیە. گەر بمانەوێت وەڵامی ئەم پرسیارە بنەڕەتیە بدەینەوە ئەوا وەڵامدانەوەی کۆمەڵێك پرسیاری وردتر خۆیەخۆ دەبنە وەڵامی پرسیارە سەرەکیەکە، بۆ نموونە: کێ فێر دەکەین؟ سیاسەتی فێرکردن و ستراتیژی پلان و نەخشەکان وەڵامدەری ئەم پرسیارەن، چیی فێری خوێندکاران دەکەین؟ وەڵامی ئەمیش پرۆگرام و بابەت و ناوەڕۆکی پرۆسەی فێرکردنە، چۆن کاری فێرکردن بەئەنجام دەگەیەنین؟ ئەمیان ڕێگاو شێوازەکانی وانەوتنەوە دەگرێتەوە، دەرەنجامی فێرکردن چیە؟ وەڵامدەرەوەی ئەمە هەڵسەنگاندنی پرۆسەی فێرکردنە.

کەواتە فەلسەفەی پەروەردە یارمەتیدەرمانە بۆئەوەی بگەینە شێوازێك، یا ڕێگایەك، یاخود ئامرازێك تا بتوانین بەهۆیەوە پرۆسەی فێرکردن ئەنجام بدەین. ڕوونکردنەوەشمان دەداتێ کە بۆچی فلان ڕێگا، یاخود شێواز بگرینەبەر، لێرەدا فەلسەفەی پەروەردە لەو نۆتە مۆسیقیانە دەچێت کە ئاوازەکانی پرۆسەی پەروەردەیی ڕێك دەخەن و بەشەکانی دەبزوێنن بێئەوەی هیچ نەشازی، یا کەموکورتی و پەشێوی پێوە دەرکەوێت.

گرنگی و بایەخی فەلسەفەی پەروەردە لەوەدا دەردەکەوێت کە بەشێوەیەکی گشتی هەڵقوڵاوی تایبەتمەندێتی هزرو ئەرکەکانی فەلسەفەیە بەتایبەتیش فەلسەفەی زانست، بەجۆرێك لەئێستادا بۆتە میتۆدێك بەم خەسڵەتانەی لای خوارەوە دەناسرێتەوە:

- وەسفکردن: هەڵدەستێت بە وەسفکردن و ڕوونکردنەوەی دیاردەو گرفتە پەروەردەییەکان، هەروەها هۆکاری کەموکورتییەکان و دەرەنجامی کاریگەرییەکانیان لەسەر پرۆسەی پەروەردەیی، بەو جۆرەی کە لەتوانادا بێت ئاراستەی کارەکان لەم بوارەدا بکرێت.
- تێڕامان: هەوڵدەدات دیدو تێڕوانینێکی سەرتاسەریانە بۆ هەموو بنەماو بەشەکانی پەروەردە پێکەوە بنێت وەك: سروشتی مرۆییانە، زانین، پرۆگرام، هۆکارەکان، هەڵسەنگاندن، سەرەڕای ئاراستەکردنی هەڵسوکەوتی فێرکاران و فێرخوازان.

- ڕاڤـەکردن و پێکـەوە بەسـتن: مەبەسـت ڕاڤـەکردنی: بیرۆکـەکان، تیۆرەکان، چەمکەکان، یاساو ڕێساکانە کـە ئەمانـەش دەرخـەری شیاوی و گونجـاوی و سـودەکانی پـەروەردەن، لەپاشـاندا پێکەوەبەسـتنی ئەمانـە بـۆ دروستکردنی یەکەیەکی ڕێکخراو و تەواو دوای سەرنجدان و هەڵبژاردنێکی ورد.

- لێکدانەوەو ڕێنیشاندان: واتـە لێکدانـەوەی: دیاردەکـان، گرفتـەکان، پێکهاتەکان، ئەو ئەرکانەی بەجێـدەهێنرێن... بەشـێوازو میتـۆدی دیـاریکراو لێکدانەوە بـۆ ئـەم چـەمکانە دەکـات بـەو مەبەسـتەی ببێتـە ئاڕاسـتەکەرو ڕێنیشاندەری کاری پەروەردەییانە، سـەرەڕای فەراهـەمکردنی چـەند هۆکـارو ئامرازێك کە زۆرترین کەڵك و سود لەخۆ دەگرن، هەروەها پێشنیاری ڕێگەچارەی گونجاوو دروست بۆ گرفتەکان دەکات.

- ڕەخنەگرتن: میتۆدی فەلسەفەی پەروەردە ناتـەواوو خەوشـدارە گـەر ڕەخنەیەکی سەرتاسەریانەی نەبێت لەو زانیاریانەی کە سەبارەت بە بنـەماکانی پەروەردەن. واتە ڕەخنـە لـە: زاراوەکـان، چـەمکەکان، شـێوازەکان، هـەروەها ڕەخنەگرتن لەو ڕێ و شـوێنانەی لـە کـاتی پڕاکتیزەکردنـدا پیـادە دەکـرێن... ئەمانەش لەپێناو دیـاریکردن و دۆزینـەوەی هەڵـەو کەموکورتیـەکان، پاشان سەرنجڕاکێشان بەرەو ڕێگاچارەکان.

## پێنجەم: ئەرکەکانی فەلسەفەی پەروەردە

١. دیارکردنی هێڵ و ڕووخسارەکانی دیدی پەروەردەییانە.

٢. تێگەشتنی سیستمی فێرکاری.

٣. دۆزینەوەو دەرخستنی زانین (المعرفە).

٤. بەدواچوونی ئەو بەهایانەی پرۆسەی پەروەردەییان لەسەر بەندە.

٥. ئاراستەکردنی بنەما جۆراوجۆرەکانی پەروەردە.

٦. پەیبردن بە کۆمەڵێك پەیوەندی نوێ.

٧. ئاراستەکردنی چالاکییە پەروەردەییەکان.

٨. ڕێکخستنی ناوەڕۆکی پرۆسەی فێرکردن.

٩. بەرەوپێشبردنی پرۆسەی فێرکردن.

١٠. چارەسەری کێشەو گرفتەکان.

**١. دیاریکردنی هێڵ و ڕووخسارەکانی دیدی پەروەردەییانە لەڕێی دەستنیشانکردنی ئامانجە پەروەردەییەکان:**

فەلسەفەی پەروەردە هەوڵی بونیادنانی ئەو تیۆرانە دەدات کە دەرخەری: بۆچوونی کۆمەڵگان سەبارەت بە سروشتی مرۆڤەکان، تایبەتمەندیەکانی هاوڵاتی بوون، جۆری کۆمەڵگەکە، جیهان، سروشتی ئەو ژیانەی کە پەروەردە دەیرەخسێنێت. لێرەدا لەڕێی فەلسەفەیەکی گشتیەوە هەڵدەستێت بە

ئەنجامگیری ئەم تیۆرانـە بـە تێڕوانینێکـی وردبینانـە کـە بەهۆیـەوە ڕووداوە جۆربەجۆرەکان و ڕاستییە دژ بەیەکەکان لێکدەداتەوەو ڕێکیان دەخات، هەروەها هەڵدەسـتێت بـە گرێدانـەوەی بابەتـە جیاوازەکـان لـە چوارچێوەی ئەزموونـە مرۆییـەکان، سـەرەڕای کـارکردن لەسـەر ڕێکخسـتنی ئامـانج و داواکـاری و دیاردەکان لە سیستمێکی ڕێکخراودا، وە پەیوەندی نێوان بنەما پەروەردەییەکان و بواری پسپۆڕیی پەیوەندیدار بەرجەستە دەکات.

بەڵگەی ڕوون و ئاشکرای ئەم تیۆرە، یا هەر بیردۆزەیەکی تر بەندە لەسەر دیاریکردنی ئەو ئامانجانەی کە پەروەردە دەیـەوێت بـەدیبهێنرێن. بەهـەمان شێوە دانانی ئامڕازە گشتیەکان پێویستە بەدواچوونیان بـۆ بکرێـت، هـەروەها دەبێت ئامڕازەکان پێ بەپێی ئەو گۆڕانکارییە سیاسی و کۆمەڵایەتیانە بن کە دەوری پرۆسەی پەروەردەییان داوە. سیاسەتی نەخشەدانان و پلانەکان بەپێی ئەو بنەمایانەی باسکران پێشنیار دەکرێن، ستراتیژی پراکتیزەکردنیش دادەڕێژرێت. ئەرکێکی لەم جۆرە گرنگ و پڕبایەخە دەبێت هەموو پەروەردەکاران تێگەشتنی وردو زانیاری تـەواویان دەربـارە هـەبێت، واتـا کەسـانی وەك: مامۆسـتایان، سەرپەرشتیاران، بەڕێوەبەران، پلاندانەران، جێبەجێکاران و هەموو بەشداربووانی کایەی پەروەردەیی.

## ٢. تێگەیشتنی سیستمی فێرکاری لەرێی ناسینەوەی چەمکەکانیەوە:

فەلسەفەی پەروەردە هەڵدەستێت بە هەڵبژاردنی چەمك و زاراوەکان و بیروڕای ناڕاستەکراوی سیستمی فێرکردن و ڕادەی گونجاوی و سازبوونیان لەگەڵ ڕاستیەکان و ئەو پراکتیزەکردنەی لە بوارەکەدا پیادە دەکرێت، تەنانەت هەڵسوکەوت و ناڕاستەی فیکریی مامۆستایانیش دەگرێتەوە. ئێمە تا چەند زانیاری زیاترمان سەبارەت بە بنەمای فەلسەفیەوە هەبێت ئەوا تێگەشتنێکی وردو قوڵترمان دەربارەی پێکهاتەو ناوەڕۆکی سیستمی فێرکردن دەبێت، هەروەها واتاو زاراوەکان لامان ڕوون و ئاشکراتر دەبن، وە توانا دەبەخشێتە مامۆستایان و کسانی دیکەش گفتوگۆو ڕاڤەکردن لەسەر مەسەلە پرپایەخەکانی پەروەردە ئەنجام بدەن، چونکە جیاوازییە فیکرییەکانی نێو کایەی پەروەردەیی لێکنەچوونی پراکتیزەکردن بەدوای خۆیاندا دێنن، ئەمەش لەخۆیدا ڕێنەکەوتنی فەلسەفیانە دەگەیەنێت لە جەوهەردا، وە تاچەند لە واقع دووورکەوینەوەو ڕۆبچینە جیهانی تیۆرو واتاکانەوە، ئەوا مەودای نێوان لێکنەچوونەکان فراوانتر دەبنەوە، هەروەها گەر مامۆستاش لای خۆیەوە تێگەشتنی وردو تیروتەسەلی سەبارەت بەچەمك و زاراوەکان هەبێت، ئەوا وشیارییەکی فراوانتر بەکار دەبات لە سیستمی فێرکاریدا، وە بەشێوازێکی ئەقڵئامێزو ژیرانە هەڵسوکەوت دەکات و مانایەکی باڵاتر لە دیدو کردەوەکانیدا دەبینرێت، بەمەش ئەوپەڕی تواناو لێهاتوویی بەگەڕ دەخات لەجێبەجێکردنی ئەرکەکانی سەرشانی.

### ٣.دۆزینەوەو دەرخستنی زانین (المعرفة):

لەڕێی تێگەشتنی سروشت و سەرچاوەو ڕێگەکانی بەدەستهێنانی زانین، لێرەدا فەلسەفەی پەروەردە هەڵدەستێت بە دۆزینەوەو کارکردن بەپێی بنەمای زانیاری و بەردەوامبوون لەسەر ئەم ڕەوشە، هەروەها پەرەپێدانی و نوێکردنەوەی، ئەمەش بەهۆی تێگەشتن لە سروشتی زانین بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارانە: ئایا زانین جێگیرو نەگۆڕە، یاخود بە پێچەوانەوە؟ ئایا زانین گشتیەو بۆ هەموانە، یا تەنها تایبەتە بە زانایان و بیریارانەوە؟ ئایا پەیوەندی سروشتی زانین چیە بە گەردوونەوە؟ ئەی مەودای درککردنی ژیری بۆ زانین چەندە؟

هەروەها فەلسەفەی پەروەردە مشتومڕ لەسەر بایەخ و گرنگیی زانین دەکات لەنێو پرۆسەی فێرکردندا، ڕێگاو شێوازی لەبار بۆ وەدەستهێنانی زانین دەخاتەڕوو، وە دیاریکەری ئەو ڕاستیەش دەبێت کە: ئایا زانین لەڕێی هەستەکان یا لەڕێی ئەزموون، یاخود بیرکردنەوە دەستەبەر دەکرێت؟ سەرەڕای چەندین مەسەلەی دیکەش کە مانا دەبەخشنە زانین و ئاسانکاری لە بەدەستهێنان و دواجاریش پراکتیزەکردنی دەکەن.

### ٤.لێکۆڵینەوەی ئەو بەهایانەی پرۆسەی پەروەردەییان لەسەر بەندە:

سەرەڕای ئەوەی فەلسەفەی پەروەردە ڕووبەڕووی هەندێک گرفتی ململانێ و کێشمەکێشمی بەهاکان دەبێتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا گرنگی دەداتە ئەو بەهایانەو دەربارەی سروشت و بنەڕەت و جۆرو بەردەوامبوونیان و پەیوەندی نێوانیان

دەدوێت، بەو هۆیەی ئەمانە ڕۆدەچنە نێو هەموو چالاکییە پەروەردەییەکان و کاریگەری جێدەهێڵن، چونکە پێویستە ئامانجە فێرکاریەکان ئەو بەهایانە لەخۆ بگرن کە پرۆسەی پەروەردەیی لە هەوڵی بەدیهێنانیدایە، بۆ نموونە پرۆگرامەکانی خوێندن بەهاو ئامرازە باوەکانی کۆمەڵگە بکەنە پێکهاتەی بابەتەکانیان.

لێرەدا فەلسەفەی پەروەردە هەمیشە یارمەتیدەری فێرکاران دەبێت لە هەڵبژاردن و دەربڕینی ئەو بەهایانە، هەروەها دەرخەری چەند هەڵسوکەوت و ڕەوشتێك دەبێت کە لای فێرخوازان پەرەیان پێدەدرێت، باس لە چۆنیەتی گشتن بە ڕێککەوتنێك دەکات لەنێوان مامۆستایان و بەڕێوەبردندا کە سەبارەت بە جۆرو گەشەپێدانی بەهاکانە بێئەوەی هیچ جۆرە دژایەتی و پێکدادانێك لەم ڕووەوە هەبێت.

لەلایەکی ترەوە فەلسەفەی پەروەردە بەشداری دەکات لە دانانی ڕێگەچارە بۆ هەندێك کێشەو ململانێی بەهاکان لەنێوان نەوە جیاوازەکان و ئەو کەسانەی لە بواری پەروەردەییدا کاردەکەن، بۆیە دەبینین فەلسەفەی پەروەردە لەو هەوڵەدایە لێکنەچوون و جیاوازیەکان سنوردار بکات لە چوارچێوەی پرۆسەکەدا جێیان بکاتەوە، ئەویش لەڕێی بواردان بە هەبوونی بڕێك لێکنەچوون و جیاوازی بەهاکان، هەروەها لەو پێناوەدا کاردەکات کۆمەڵێك ڕێساو نەریت بچەسپێنێت کە ڕەخسێنەری شیاوی و گونجاوی جیاوازیەکان بکەن، ئەویش بە داڕشتنەوەی چەند چەمکێکی تیۆریانەی تەبا لەگەڵ بەها باوەکانی کۆمەڵگە، هەروەها

هەوڵدان بۆ کەمکردنەوەو ڕیشەکێشکردنی ناڕێکی و کەموکورتی ئەو بەهایانەی ئێستا لە کۆمەڵگەدا باوون، وە پەردەش هەڵدەماڵێت لەسەر دیاردەی دزێوو هەڵخەڵەتێنەری ناڕەسەن، سەرەڕای بڕیاردان لەسەر چەسپاندنی کۆمەڵێک بەها لە پرۆسەی فێرکردن و دەرهاویشتەکانی کاری پەروەردەییانە.

**٥. ئاڕاستەکردنی بنەما جیاوازەکانی پەروەردە:**

بەو حوکمەی پەروەردە مەیدانی پراکتیزەکردنە، ئەوا سەرچاوەی بنەماکانی کۆمەڵگەو دەرەنجامە زانستیەکانە، وە پێویستی بە ڕێنیشاندەرێکە بۆ کارکردن لەپێناو ڕێکخستنی هەموو ئەو شتانەی بەچاک دەزانرێن و وەلانانی شتگەلێك کە پێویستە دووربخرێنەوە،

هەر بۆیە ئەرکی یەکەمینی فەلسەفەی پەروەردە دەبێتە دۆزینەوەی هاوکێشەیەکی وردو قووڵ تا سەرکەوتوو بێت لە هەڵبژاردنی نێوان بنەمای نازانستی (کە ڕاستەوخۆ لە کۆمەڵگەوە دێنە ناو ئەم کایە هەستیارە) و بنەما زانستیەکانی ڕاستیەکان. ئەم کارەش لەپێناو دانانی ڕێگەچارە بۆ کێشەی لێکنەچوون و دژایەتی نێوان کۆن و نوێ، هەوڵدەدات بۆئەوی کۆن و نوێ پێکەوە هەڵبکەن، یاخود گۆڕانکاری لە کۆندا ئەنجام دەدات تا بگونجێت لەگەڵ نوێدا، بێگومان بێ دەستبەرداربوون لە بەها نەگۆڕو چەسپیوەکانی کۆمەڵگە، چونکە ئەوانە نیشانەی جیاکەرەوەی کۆمەڵگەیەکن لە کۆمەڵگەیەکی تر.

فەلسەفەی پەروەردە لە هەوڵی ڕەخساندنی ژینگەیەکی دستەبژێرە تا ئەم پرۆسە مەزنە بە شێوازێکی ڕاست و تەندروست پیادە بکرێت.

ئەرکی وردبینی و پشکنینی هەر تیۆرو بیردۆزەو ئاراستەیەکی نوێی بیرکردنەوە لەئەستۆ دەگرێت کە تازە دێنە نێو ئەم کایەوە، بەوردی لێکۆڵینەوەو ئەزموون و ڕەخنەیان ئاراستە دەکات، بۆئەوەی بتوانێت لەبارو گونجاوەکانیان بە بیرکردنەوەی باوی کۆمەڵگە دیاری بکات، هەروەها بکرێنە بەشێکی پرۆسەی پەروەردەیی، بۆ نموونە گەر لە پرۆسەی پەروەردەییدا کۆمەڵێك لەو نەریت و ڕێ و ڕەسمانە هەبن کە بەسەرچوون و باویان نەماوە، ئەوا فەلسەفەیەکی پەروەردەیی لەم جۆرەمان پێویستە کە هەمیشە لە هەوڵی هەڵسەنگاندن و بەراوردکردنی بەڵگەو هۆکارەکاندا بێت، چونکە زانستی سەردەم هەرچەند تیۆرو بیردۆزو دەرەنجامی تازەو بیرۆکەی نوێیان هێناوەتە کایە، بەڵام هەندێکیان ڕەنگە دژو پێچەوانەی بەها باوەکانی نێو کۆمەڵگە بن، زۆر بەسەختی و دژواری کۆمەڵگایەك قبوڵیان بکات، هەرچەندە لای کۆمەڵگایەکی دی بە ڕاست و دروست بزانرێت، ئەوا لێرە ئەرکی فەلسەفەی پەروەردە دەبێتە لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون و ڕەخنەگرتن و هەڵسەنگاندنی ئەو بنەمایەو لەپاشاندا هەوڵدەدات ئەمانە لە پێکهاتەیەکی گونجاوو هاوسەنگیەکی وردەکارانە پێکەوە ڕێك بخات، هەموو گۆڕانکاری و چاکسازیەك لە پرۆسەی پەروەردەییدا دەبێت لەژێر چاودێری فەلسەفەی پەروەردەدا ڕووبدات.

## ٦- پەیبردن بە کۆمەڵێك پەیوەندی نوێ لەبری قایلبوون بە گۆڕانە بنەڕەتیەکان:-

گۆڕانکاری لە هەموو کۆمەڵگایەکدا ڕوودەدات کە ئەمەش نیرادەی خواوەندە، ئەو گۆڕانە خێرایانە ئێستا چ لە ئاستی ناوخۆیدا، یان ناوچەیی، یا جیهانی ڕوودەدەن بەدوای خۆیاندا گۆڕان بەسەر سیستم و چالاکی و کایە جۆراوجۆرەکانی کۆمەڵگە دێنن. ئەم کارەش وا دەسەپێنێت پەروەردەش وەك هاریکاریەکی دیکەی کۆمەڵگە پێویستی بە گۆڕانکاری لە بوونیات و ناوەڕۆك و شێوازەکانیدا هەیە، بەو جۆرەی گونجاوو شیاو بێت، وە شانبەشانی گۆڕانە تیژڕەوەکانی لایەنەکانی دیکەی کۆمەڵگە ڕێبکات، هەر بەم هۆیەوە فەلسەفەیەکی پەروەردەییانەی وا دەخوازێت چاو بەو گۆڕانکاریانەدا بخشێنێتەوە، وە بە جۆرو ژمارەو قەبارەی هەڵسەنگاندنی تەواوی ڕەهەندەکانی گۆڕان بگرێتە ئەستۆ، نەك تەنها لاسایکردنەوەی کوێرانە چاکسازییەکی پەرت و بچووك ئەنجام بدات، وە یا پەروەردە بکرێتە کایەی لێکدانەوەی بیروڕا دژبەیەك و هەوڵە پڕلە کەموکوڕیەکان.

ئەم کارەش پەیبردن بە چەندین پەیوەندی نوێ و مۆدێرن دەخوازێت و دەیکاتە ئەرکی فەلسەفەی پەروەردە.

چاوخشاندنەوەو پێداچوونەوەی پەیوەندییە کۆن و بەسەرداچووەکان و داڕشتنەوە یان لەژێر تیشکی ئەم گۆڕانکاریە تازانەی هاتوونەتە ئارا، دۆزینەوەی

ڕێگەچارەی نوێ و شێوازی پێشکەوتووانە، ئەمەش لەڕێی زیندووکردنەوەو وروژاندنی ڕۆحی. پرسیارکەرانەو دوورکەوتنەوەو دابڕان لە واقیع و سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی هەڵوێست و ڕووداوەکان، بە قوڵ سەیرکردنی چەمکە هەڵەکان و شێوازە نەگونجاوەکان، هەموو لایەن و کایەو بوارەکانی ژیان بەپێی خواستی گۆڕانکاریەکان و گونجاوییان ڕێك بخرێنەوە، پاشان سەرلەنوێ ڕێکخستنەوە بەپێی دیاردە تازەکان کە دەبنە هۆی لەناوبردنی دژایەتی و نەگونجان و نەشیاوی نێوان بیرۆکەکان و شێوازەکانی پڕاکتیزەکردنیان، یاخود نێوان ئەگەرو بەڵگەنەویستەکان، وە یا نێوان تیۆرو پڕاکتیزەکردن.

**٧-ئاراستەکردنی چالاکییە پەروەردەییەکان بە گشتێتی و هەمەلایەنیانەوە:-**

بواری چالاکییە پەروەردەییەکان جۆراوجۆرو فراوانن، بۆ نموونە دامەزراوە فێرکاریەکان فرە ڕەهەندن وەك: ڕێکخستن، بەڕێوەبردن، کاروباری هونەری جۆراوجۆر، ئەمانە لە ئاستی سەنتەرەوە، یاخود نەتەوایەتیەوە دەست پێدەکەن و بە پلەیەك خوارتر دەگەنە ئاستی هەرێمی (پارێزگاکان و بەڕێوەبەرایەتیەکان)، پاشان بۆ ئاستی ناوخۆیی لەنێو خوێندنگاکاندا،جگە لەم ئاستانەش پلەی خوێندنی جیاواز هەن و پەلیان بەنێو هەموو ناوچەکانی وڵاتدا کێشاوە، لێرەو لەوێ ئاستی کاری پەروەردەییانە بوونی هەیە لەنێوان دارێژەکانی سیاسەتی پەروەردەییانەو پلان و نەخشەدانەران و سەرپەرشیارانی هونەری پەرتووکەکانی خوێندن و جێبەجێکەرانی پرۆسەی پەروەردەیی تا دەگاتە نزمترین ئاستی بنکەی

فێرکردن، هەروەها قۆناغەکانی خوێندن و فێربوون ئاست و پلەی جیاوازیان تێدایە، هەریەك لەو ئاستانە پلەی جۆراوجۆری (بڕیار لەسەردراوەکان "المناهج-المقررات الدراسیە") و چالاکی پەروەردەییانەی جیاواز بە هەر قۆناغێك لە قۆناغەکانی خوێندن ئامادەییان هەیە، سەرەڕای بوونی کەسانی شارەزا لە بواری پەروەردەییدا وەك سەرپەرشتیاران و مامۆستاو کەسانی دیکەی چالاك و هەڵسوڕاوی نێو ئەم پرۆسەیە، ئەمانیش لە ئاست و پلەی جیاوازدان بۆ ئەنجامدانی ئەرك و چالاکییەکان.

ئەم هەموو ئاست و چالاکیانەش چوارچێوەیەکی فیکری دەخوازن کە لەنێویدا پرۆسەکانی پەروەردەیی ڕێکبخات و ئاڕاستەکەری ئەو کارو چالاکیانە بکات بە شێوازێکی سەرتاسەری و گشتی بیانخاتە سەر ڕێی بەدیهێنانی دوا ئامانجەکانی پەروەردە. ئەو چوارچێوەیەشی باسی لێ دەکەین فەلسەفەی پەروەردە دەگرێتەوە، کە ئەرکی ڕێکخستنی پێکهاتەو بەشە جیاوازەکانی پەروەردە لەئەستۆ دەگرێت: ئەمانەش هەموو پێکەوە لە یەکەیەکی تەواوو پێگەشتوودا هاوکاری یەکتر دەکەن بە ئاڕاستەی دوا ئامانجی پەروەردە.

**٨.ڕێکخستنی ناوەڕۆکی فێرکردن:-**

فەلسەفەی پەروەدە بەشداری دەکات لە ڕێکخستنی ناوەڕۆکی پرۆسەی فێرکردن، ئەویش بەپێی چەند بنەماو پێوەرێك، یەکبوونی ناوەکی هەریەك لە بابەتەکانی خوێندن دەپارێزن، پلاندانەران و داڕێژەرانی پرۆگرامەکانی خوێندن

پابەند دەبن بەم بنەماو پێوەرانە، ئەو بنەڕەتانەش لەپێناو بونیادنانی پرۆگرامەکان و شێوازی پراکتیزەکردنیان، پاشان هەستانی مامۆستایان هەریەک بەپێی پسپۆڕیتی خۆی بە پراکتیزەکردنی ناوەڕۆکی خوێندن، ئەویش بە هەڵبژاردنی ڕێگەی گونجاو و شیاو.

لێرەدا فەلسەفەی پەروەردە دێتە مەیدان و پرۆگرامەکانی خوێندن بەجۆرێکی لۆژیکیانە ڕێکدەخات و ڕیزبەندیان دەکات، واتە ناتوانرێت لە بەشێک تێبگەین تا تێگەیشتنمان بۆ بەشەکانی پێشووتری ئەو بابەتە نەبووبێت. هەروەها بیرکردنەوەیەکی لۆژیکیانەی تەندروستیان تێدا بێت کە خەسڵەتی ڕوون و ئاشکرایی و ئاسانکاری لە بیرکردنەوەدا پەرەپێبدەن، سەرەڕای تایبەتمەندیان بە زانیاری ڕاستی و گونجاو بن بۆ هەڵوێست و ڕووداوی جۆراوجۆر، بابەتی (موضوعي) بن، بەڕۆدار بن لە بەئەقڵاندنی هەڵسوکەوت و ڕەوشتی ئامانجدا.

هەروەها فەلسەفەی پەروەردە یارمەتیدەری ڕێکخستنەوەی بابەتەکانی خوێندنە لەسەر بنەمای سایکۆلۆژیا، ئەمیش لەڕێی:- پرۆسەی فێرکردن و ئەنجامی پەروەردەییانە لەسەر بنەڕەتی حەزو ئارەزوو و توانا و شارەزاییەکانی فێرخواز دابڕێژرێن، زاخاوەدەری بەهرەکان و ڕێخۆشکەر بێت بۆ بەرەوپێشچوون و پەرەسەندن. پێگەشتن لەڕووی هزری و زانستی و پەروەردەییەوە.

**٩-بەرەوپێشبردنی پرۆسەی فێرکردن بەهۆی هەڵسەنگاندنیەوە:-**

بەو پێیەی پەروەردە ئامادەکەری نەوەی نوێیە بۆ دوارۆژ، داهاتووش بەتەواوی نەزانراوەو پەی پێ نەبراوە، ئەوا ئەرکی فەلسەفەی پەروەردە بەهۆی ئەو دیدەتێڕامانەی هەیەتی بۆ لایەنەکانی پەروەردە دەبێتە پێشبینیکردنی داهاتوو، هەڵێنجاندنی ئەگەرو چاوەڕوانکراوەکانە، دەبێت داهێنەرانە هەوڵی بەرەوپێشبردنی ئەم پرۆسەیە بدات،لێکدانەوە بۆ بونیادەکانی فێرکاری بکات، لە سەرەتادا بە هەڵسەنگاندنی ئەوەی ئێستا لە کایەدایەو زانین و دەستنیشانکردنی کەموکوڕی و خەوشەکان،پاشان گەڕان بەدوای ئاسۆکانی داهاتوو بۆ جێبەجێکردنی کاری پێویست، ئامادەسازی لەم بوارەدا. هەوڵی گەڕان و پشکنین بدات بۆ دۆزینەوەو بەکاربردنی ئەزموون و شارەزایی نوێ لە ڕۆژگاری ئێستادا دەستەبەرکراون، یاخود سودبینین و ڕێککردن بەپێی شارەزایی و زانیاری و ئەزموون و داهێنانەکانی وڵاتە پێشکەوتووەکانی جیهان، هەمیشە بەردەوامبێت لە گەڕان بەدوای شێوازی نوێ و کاریگەر بۆ بەرەوپێشبردنی ئەم پرۆسەیە. ئامادەسازی بکات بۆ ڕەخساندنی کەش و هەوایەك بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی داهاتوو و ئەگەرەکانی.

**١٠-چارەسەری کێشەکان لەڕێی شیکردنەوەی خاڵە بەهێزو لاوازەکان:-**

فەلسەفەی پەروەردە خسڵەتێکی ڕەخنەگرانەو تێڕامانی هەیە، ئەمەش دەیکاتە یارمەتیدەرێك بۆ چارەسەری گرفتە پەروەردەییەکان لەڕێی گەڕان

بەشوێن ڕەگ و ڕیشەی گرفتەکان و لێکۆڵینەوەی ئەو فاکتەرە کارامەو چالاکانەی پرۆسەی فێرکردن هەڵدەستێت بە پشکنین و وردبینی پێکهاتەکان و کارلێکی نێوان بەش و لایەنە جیاوازەکانی فێرکردن و دەستنیشانکردنی خاڵە بەهێزو لاوازەکان لەم پرۆسەیەدا، پاشان هەوڵدەدات چارەسەری گونجاوو لەبار بدۆزێتەوەو کێشەکان گەمارۆ دەدات، سنورداریان دەکات ئەویش بەهۆی پشتگیریکردن و لایەنگیریی ڕووە باش و پۆزەتیڤەکانی بواری فێرکردن دەگەڕێت بە شوێن ئامرازو شێوازی نوێ بۆئەوەی بەسەر کێشەو گرفتە سەخت و ئاڵۆزەکاندا زاڵبێت. وە بەردەوام فەلسەفەی پەروەردە تواناو هێزی فراوان دەبەخشێتە مامۆستایان و کەسانی پەروەردەکار بۆئەوەی ببنە خاوەن دیلێکی تەندروست و ڕاست بتوانن ئەو کێشەو گرفتانەی پێ چارەسەر بکەن لە پرۆسەی پەروەردەو فێرکردندا ڕووبەڕوویان دەبێتەوە.

لەبەر ئەو هۆیانەی باسکران و چەند خاڵێکی دیکەش، فەلسەفەی پەروەردە بۆتە پێویستیەکی سەرەکی بۆ هەر یەك لە مامۆستایان و پەروەردەکاران و هەڵسوڕاوانی بواری پەروەردەو فێرکردن، بەڵکو تەنانەت بۆ سیاسەتمەداران و ئابووریناسان و چەندەها لایەنی دیکەی ژیان بەشێوەیەکی گشتی، چونکە هەر فەلسەفەی پەروەردەیە دەبێتە چەکی دەستی مامۆستاو پاڵپشتێك بۆ سەرکەوتنی لە کارەکەیدا کە هەرگیز ناتوانێت دەستبەرداری بێت، هەر ئەمەش بۆتە پێوەری سەرکەوتن، یا شکستی ئەو کەسە دەردەخات لە بەئەنجامگەیاندنی

ئەو ئەرك و لێپرسراوێتییەی لەسەر شانیەتی. لەمەش گرنگ تر هەڵدەستێت بە ئاڕاستەکردن و ڕاستکردنەوەو ڕێنمایی ئەو هەڵسوکەوتانەی فێرکاران ئەنجامی دەدەن، لەسەر ئەو بنەما زانستیە بەدیهاتووەی کە پێوەری حوکمدان بێت بۆ سەرکەوتنی ئەم فەلسەفەیە.

پاش باسکردن و لێکدانەوەی ئەم تەوەرانەی کە لە بەشی یەکەم و دووەم و سێیەمدا خرانەڕوو، ئێستا لە بەشی چوارەمی ئەم کتێبەدا هەوڵدەدەین تیشکێك بەخێرایی بخەینە سەر ئەو فەلسەفەو تیۆرە پەروەردەییانە کە لە ئەدەبیات و ڕێبازە پەروەردەییەکاندا جێگیربوون، بۆئەوەی ئەنجامگیری بیرۆکە سەرەکیەکانی فەلسەفیانە بکەین لەسەر بەرجەستەترین و دیارترین ئاڕاستەکانی فەلسەفەی پەروەدەیی بوەستین وەك تیۆرو پراکتیك، پاشان حوکمدانی ئەم فەلسەفانە بەسەر دەرەنجامەکانی کاری پەروەردەیی چ پەیوەندی یا هەڵسوکەوت، یاخود شارەزایی و لێزانیەکان ئاڕاستەکانیان بگرێتەوە.

لە سەرەتادا دەتوانین جیاکارییەك لەنێوان فەلسەفەی پەروەردەو تیۆرەی پەروەردەییدا بکەین، چونکە فەلسەفەی پەروەردە واتا:- ئەو چالاکیانە لەخۆ دەگرێت کە کۆمەڵێك لە فەیلەسوفان و پەروەردەکاران و کەسانی دیکە پێی هەڵدەستن بۆ بەرجەستەکردنی پەیوەندی نێوان فەلسەفەو پەروەردە، هەروەها ڕوونکردنەوەی پرۆسەی پەروەردەیی و ڕەخنەگرتن و ڕاستکردنەوەکان بەپێی کێشەو گرفتە ڕۆشنبیریەکان بەو مەرجەی ئەم فەلسەفە پەروەردەییە ئەم چەند مەرجەی لەخۆ گرتبێت:- پشت بەستن بە ڕاستییە بابەتیەکان و ڕێکخستن و بنەماو پێکهاتەی ڕوون و ئاشکرای هەبێت، هەروەها سەرتاسەری و گشتی بێت بۆ سەراپا ئەو فاکتەرانەی یارمەتیدەرن لە ڕووبەڕووبوونەوەی کێشە پەروەردەییەکان، بەڵام تیۆرەی پەروەردەیی:- پێکهاتووە لە کۆمەڵێك چالاکی پراکتیکیانەی پێکەوەگرێدراو لە شێوازی چەند بیردۆزێکی دیاریکراو دەردەکەون، وە بە دیدێکی تیۆریانەیی دەستپێدەکەن و دەبنە تاڕاستەکەرو ڕێنمایی چالاکییە پراکتیکیەکان.

ئەو فەلسەفانەی لەم پەرتووکەدا هاتوون دەکرێت لە دوو لایەنەوە بخرێنە ڕوو: یەکەمیان:- بەرجەستەکردنێکی بیرۆکەو هێڵە سەرەکیەکانی ئەو فەلسەفەیە لەخۆ دەگرێت لە لایەنی پەروەردەییەوە. کاریگەری و شوێنەواری پەروەردەیی سەرەڕای لایەنەپراکتیکیەکانی فەلسەفەکە. لەبەرئەوەی ژمارەیەکی زۆر فەلسەفەو ڕێبازو قوتابخانەی فیکری لەنێو فەلسەفە باوو ناسراوەکاندا هەیەو

چەندین لق و ڕێچکەیان لێدەبێتەوە، کە هەندێکیان خاڵی جیاکەرەوەو تایبەتمەندێتی خۆیان هەیە، ئەوا ئێمە لەم ڕوونکردنەوەیەدا تەنها ئاماژە بەو فەلسەفە پێشەنگ و ناودارانە دەکەین.لە ڕێچکەو جومگە وردەکانی نێو فەلسەفەکان خۆمان دەپارێزین و باسەکەمان دەربارەی فەلسەفە سەرەکی و هێڵە فراوانەکانیان دەبێت... ئەو فەلسەفە پەروەردەییانە لێرەدا ئاماژەیان پێدراوە ئەمانەن:

١- فەلسەفەی ئایدیایی
٢- فەلسەفەی ڕیالیزمی
٣- فەلسەفەی پراگماتیزم
٤- فەلسەفەی ئیسلامی
٥- فەلسەفەی سروشتی
٦- فەلسەفەی بوونگەرایی
٧- فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم.

## ١ - فەلسەفەی پەروەردەی ئایدیایی ( المثالية ):-

هەرچەند فەلسەفەی ماتریالی (المادية) پێش فەلسەفەی ئایدیاییە، بەڵام فەلسەفەی ئایدیایی دادەنرێت بە دێرینترین فەلسەفەیەك کە ڕووخسارو بنەما

پێکهاتەکەی ڕوون و ئاشکرابێت، هەمیشە بیریاران و فەیلەسووفانی بەلای خۆیدا بەکێشکردووەو پەروەردەکاران و زانایان لەم سەردەمەشدا بەپەرۆشەوە لایەنگیری دەکەن و دەکرێتە بنەمای دیدو بۆچوونەکانیان سەبارەت بە پەروەردەو ژیان بەگشتی. لەنێو سنوری فەلسەفەی ئایدیاییدا چەندین ڕێبازو ڕێچکەو شەپۆلی ئایدیایی دیکە جێی خۆیان کردۆتەوەو خاڵی جیاوازو تایبەتمەندێتی خۆیان دەپارێزن، بەڵام سەراپای ئەم لقە لاوەکیانە دەچنە سەر فەلسەفەی ئایدیایی لە ئاڕاستەی گشتیدا، وە بە بەشێك لە ئایدیا دادەنرێت.

سەرەتای سەرهەڵدانی فەلسەفەی ئایدیایی دەگەڕێتەوە بۆ ئیفلاتوون (٤٢٩-٣٤٧ پ.ز) کە بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی ئەم ڕێبازە فەلسەفیە دادەنرێت، بەمە سەرەتاییەکانی لەلایەن ئەم فەیلەسوفەوە داڕێژراون شانبەشانی ئیفلاتون و سوقرات ئەم فەلسەفەیەی بە بیرە مەزن و نەمرەکانیەوە دەوڵەمەندتر کردبوو. پاشان لەسەر دەستی چەند فەیلەسوفێکی بەناوبانگ وناسراوو بەرجەستەی دنیای هزر ئایدیا بەرفراوانتر کرا، وەك: (بارکلی، هیوم، شوپنهاوەر، کانت، سبینوزا)و چەند ناوێکی دیکەش، هەرچەندە جیاوازی مەزن و لێکنەچوونی ئاشکرا لەنێوان دیدو بۆچوونەکانی ئەم فەیلەسوفانەدا هەبووە، بەڵام ناودارترین پەروەردەکارانی فەلسەفەی ئایدیایی بریتین لە: (کۆمینۆس، بستالۆزی، فرۆبل) لەم ناوانەوە بۆمان دەردەکەوێت کە فەلسەفەی ئایدیایی بەشێوەیەکی بەرفراوان

لە هزری فەرەنسی و ئەڵمانیدا بڵاوو تەشەنە سەندوو بووە ، ئەمەش پەیوەندی بە خوێندنگاکانی بڵاوکردنەوەی وشیاری ئایینیەوە هەبووە .

بەشێوەیەکی گشتی فەلسەفەی ئایدیایی گرنگی بەو جۆرە بیرکردنەوەیە دەدات، کە بوون (الوجود) دەگەڕێتەوە سەر هزر (الفکر)، واتە ئەو ژیانە سروشتیەی ئێمە تێیدا دەژین و دەوری داوین لە بنەڕەتدا دنیایەکی ڕۆحانیە، چونکە واقعی ڕەهابوونی نیەو تەنها دیاردەو ڕووکەشی ئەو واقعە ڕۆحیەیە، بەم پێیەش ڕووخساری دەرەکی مرۆیی بوونی ڕاستەقینەی نیە، بەڵکو لە ناوەڕۆك و جەوهەردا ڕۆحە، واتا ڕۆح یا ئەقڵ (ژیری) جیهانی ڕاستەقینەن، بەڵام شتەکانی دیکەی ئەم جیهانە چ شتێك نین جگە لە سایەو سێبەری جیهانی نموونە باڵاکان (ئایدیکان) نەبێت، ئەم شتگەلە بوونیان نیە تەنها بەپێی توانای درکپێکردنی ئەقڵ نەبێت.

دەتوانین ئەم مانایە بە تێڕوانین لە ڕەگ و ڕیشە سەرەتاییەکانی فەلسەفەی ئایدیاییەوە ڕوونبکەینەوە بەپێی تیۆرە نموونە باڵاکانی ئیفلاتون (المثل الاعلی)،جیهان دەکرێتە دوو بەش:

١- یەکەم: جیهانی ئاسمان و باڵا کە شتگەلی ماتریاڵی لەخۆ ناگرێت، بەڵکو تەنها نموونە باڵاکانی (ئایدییەکانی) وەك: ڕاستی، چاکە، جوانی... هتد لەخۆ دەگرێت، هەر لێرەشدا دادپەروەری و ڕاستی ڕەها بوونیان هەیە، ئەم جیهانەش

تاهەتایی و نەمرە بەهیچ جۆرێك گۆڕانی بەسەردا نایەت و هەروەاش بەردەوام دەبێت .

٢- دووەمیان: جیهانی خوارەوە کە ماتریالّی و گۆڕاوەو بە هەستەکان درکی پێدەکەین،خەسلەتی ئەم جیهانەش شلەژاوی و شێواوی و گۆڕانەو دەرەنجامی لەناوچوونە.

بەم پێیەش ئایدیا ڕاستیەکی سەرتاسەری پەتیەو بوونێکی ڕەهای هەیە، جیهانی ڕەوشتە جوان و بالآکانە، بەهێزترین ڕاستیەو بەنرخترین بەهای هەیە، بەلآم جیهانی ماتریالّی هەستپێکراوو جیهانێکی خۆڕانەگرو بەردەوام لە گۆڕاندایە، هەر لەبەر ئەم هۆیانە بە ساختە دادەنرێت و بوونی ڕاستەقینەی نیە تەنها لەو کاتانەدا نەبێت کە بەڕادەیەك لە جیهانی نموونە بالآکان نزیك دەبێتەوە، چونکە هەستەکان لە توانایاندا نیە زانینیان سەبارەت بە ڕاستی هەبێت و درکی پێ بکەن، چونکە هەست ڕاستگۆ نیە لە درکپێکردندا. ئەو زانینەی لەڕێی هەستەوە دەکرێت تەنها نیشانەو ئاماژەن نەك حەقیقەتی شتەکان بن، واتا تەنها درك بە مەسەلە گۆڕاوەکان دەکەن، بەلآم ژیری وە یا ڕۆح ئەو ئامڕازە ڕاست و دروستەیە کە دەگاتە هزرو ڕاستیەکان، چونکە ئەقلّ لەتوانایدایە بگاتە ئەو بیرو هزرە نەگۆڕانەی کە لە جیهانی نموونەیی بالآدا هەن، وە جێگیری و نەمری هەر لەم جیهانە بالآیەوە بەدەست هێناوە.

بەو پێیەی ڕۆح پێش هاتنە خوارەوەی بۆ جیهانی خوارەوە (العالم السفلی) و نیشتەجێ ببێت لە جەستەیەکی ماتریالدا، ڕاستیەکان و نموونە بالاکان (ئایدییەکانی) دەزانێ، بەڵام لەو کاتەی لەنێو جەستەیەکی ماتریالدا گیرسایەوە لەو هەوڵەدا دەبێت ئەو زانیاریانەی سەبارەت بە ڕاستیەکان و جیهانی بالاکی پێشتر دەیزانی بیگێڕێتەوەو بیر خۆی بخاتەوە، لەم کاتەشدا پشت بە ئەقڵ دەبەستێت، چونکە هۆو ئامڕازێکی دروستە بۆ گەشتن بە ڕاستی و بیرە تەمرەکان، وە هەر ئەقڵە ئەو توانایە دەبەخشێتە مرۆڤ نزیکتر بێتەوە لە ڕاستی و ڕەوشتە بەرزو بالاکان،جەستەش مرۆڤ لە هەڵەو تاوانەکان نزیک دەکاتەوە، چونکە جەستە مەحکومی غەریزەیەو لەژێر ڕکێفی غەریزەکاندایە، بەڵام لەو کاتەی مرۆڤ ئەو توانایەی هەبێت کە کۆنترۆڵی ئەقڵ بکات، ئەوا لە خراپەکاری و پلە نزمی دوور دەکەوێتەوەو نزیك بە ڕاستی و جیهانی بالا دەبێتەوە.

گەر (بارکلی) زیادەڕەوی کردبێت لە بەهای ئەقڵ و بە سەرچاوەی بوونی شتە ماتریالەکانی دانابێت، ئەویش بەو پێیەی کە بوونی شتە ماتریالەکانی بەڕادەی درکپێکردنیانەوە گرێدابێت، ئەوا (کانت) هەوڵێکی میتۆدیانەی خستەڕوو بۆ دیاریکردنی ئەو سنورە وردانەی کە دەگونجێت لە چوارچێوە یاندا ئەقڵ بەکاربهێنرێت وەك ئامڕازێکی زانین و گەشتن بە ڕاستیەکان لەڕێی ئەزموونە هەستیەکانەوە، کە ئەمانیش پێکهێنەری ئەو بەخشینە پێویستانەن بۆ زانینە ئەقڵیەکان.

(هیگڵ) ڕەهەندێکی زیاتری بەخشیوەتە ئەقڵی ڕەها لـە ڕاڤەکردنەکیـدا، ئەویش بە بەکارهێنانی میتۆدی دیالێکتیکی، کە لە مەسەلەیەك، یا کێشەیەك و دژەکەی پێکهاتووە، ئەمیش وەك ڕێگەیەك بۆ زانین، ئەوەی بەڕاست دەزانرێت لە جیهانی ماتریاڵداو لە جیهانی ڕۆحیشدا هەر بەڕاست دەزانرێت.

بەهەرحاڵ چەندین لق و ئاڕاستەی جۆراوجۆر لـەنێو فەلسـەفەی ئایدیاییـدا بوونیان هەیەو هەر یەك لەوان هەوڵدەدات ڕای خۆی سەبارەت بـە: زانین،نموونـە باڵاکان، سروشتی مرۆییانە... بسەلمێنن.

دەتوانین بە چەند خاڵێکی کورت بنەما سەرەکیەکانی فەلسـەفەی ئایـدیایی ڕوون بکەینەوە:*

---

* هەریەك لەم خاڵانە لە دەقە عەرەبیەکەدا بە دوورودرێژی باسیان لێکراوە، بەڵام ئێمە (وەرگێـڕ) بە باشمان زانی تەنها ئاماژە بە خاڵە سەرەکیەکان بکەین، چونکە گەر خوێنەر بیەوێت زانیاری تەواوی لەو بارەیەوە هەبێت ئەوا دەتوانێت بگەڕێتەوە سەرچاوە فەلسەفیەکان و بابەتی پسپۆڕی تایبەتمەنیتی فەلسـەفیانە، جگە لەمەش هەست دەکرێت ئەو ڕوونکردنەوانە بەو شێوەیە دوورکەوتنەوەیەکە لە بابەتی ئەم وەرگێڕدراوە کە (پەروەردەیە).

ئەم کارەمان بۆ هـەموو ڕێبـازە فەلسـەفیەکان ئـەنجام داوە، واتـە بنـەما سـەرەکیەکانی هـەر فەلسەفەیەك بۆ نموونـە (بوونگـەرا، ئیـسلامی، سروشـتی...) تـەنها خاڵـەکانمان نووسـیەوە بـەبێ باسکردن...، بەڵام تا ئەو جێگەیەی فەلسـەفەکان پەیوەندیان بە پەروەردەوە هەیەو کێشەو مەسـەلە پەروەردەیەکان لەخۆ دەگرن، هەڵبژێردراون، وە وەرمانگێڕاوەتە سەر زمانی کوردی.

١. ئەقڵ و ڕۆح ناوەڕۆك و جەوهەری جیهانن و بوونی ڕاستەقینەی ئەم جیهانەن.

٢. بوونی ماتریاڵی لە خودی مرۆڤ سەربەخۆوجیاکراوە نیە.

٣.جمکێتی (الثنائیة)ی سروشتی مرۆیی.

٤-زانین سەربەخۆیە لە ئەزموون و شارەزاییە هەستیەکان.

٥-ئامانجداری- مەبەستداری (الغائیە).

٥-چەسپیوی و نەگۆڕی بەهاکان و هەتاهەتایی بوونیان.

## پراکتیزە پەروەردەییەکانی فەلسەفەی پەروەردەی ئایدیایی:

ئاساییە گەر دیلو بۆچوونی فەلسەفەی ئایدیایی لەنێو بونیادو پێکهاتەکانی پرۆسەی پەروەردەییدا سودیان لێوەرگیرابێت و کرابێتنە ئاراستەکەری ئەم پرۆسەیە،لەڕووی شێوازو ناوەڕۆك و لە ئەنجامدا ڕێکخستنی توندوتۆڵ و تۆکمەی بەخشیوەتە پەروەردە، بەدرێژایی مێژوو و تا ئێستەش کاریگەریەکی مەزنی لەسەر ڕەوتی پەروەردەو جۆرەکانی پەروەردە جێهێشتووە.

فەلسەفەی ئایدیایی لەم ڕووانەدا ئاراستەکەری پەروەردەی کردووە:-

١- بونیادی سیستمی فێرکردن ٢- ئامانجەپەروەردەییەکان ٣- میتۆد، یا پرۆگرام ٤- شێوازەکانی وانەوتنەوە ٥- چالاکییە فێرکاریەکان ٦- پلەوپایەی مامۆستاو خوێندکار.

ئێستاش بەکورتی ئاماژەیەك بەم خاڵانە دەدەین:-

١- بونیادی سیستمی فێرکردن:

هەوڵە سەرەتاییەکانی فەلسەفەی ئایدیایی کە لەلایەن سوقرات و ئەفلاتوونەوە دران، بەرووبوومی خۆیان هەبوو لە پێکهێنانی سیستمێکی خوێندن کە دابەشکرا بەسەر چەند قۆناغێکی خوێندندا لەگەڵ توانا و لێهاتوویی تاکە کەس گونجاو و شیاو بن لەڕووی ئەکادیمی و ژیری و ئاکاریەوە، هەر قۆناغێك لە چەند ئاستێکی یەك بەدوای یەك پێکدێن، بابەتەکانی خوێندن بە شێوازێکی لۆژیکانە ڕیزبەند کراون، چونکە ئەقڵی مرۆڤ ڕێکخستنێکی لۆژیکانەی هەیە، بۆ نموونە مێژوو ناخوێنرێت هەتا خوێندنەوە فێرنەبێت، وانەی مێژووش بەپێی یەك بەدوای یەك هاتنی سەردەمەکان ڕێکخراوە، هەموو قۆناغێك ئامادەکاری دەبێت بۆ قۆناغێکی نوێ بەجۆرێك لەگەڵ گەشەسەندنی توانای سروشتی بیرکردنەوەی فێرخوازدا بگونجێت، هەموو زانیاریەکانیش لە دۆخی بیرچوونەوەدا کە تووشی فێرخواز دەبێت دەردەهێنرێن، و دەخرێنە بەر ڕووناکی (واتە وشیاری فێرخوازەکە)، هەر بۆیە نەزانین دەکاتە لەبیرچوونەوەی زانین و بیرکردنەوەکان، وە فێرکردنیش لە گێڕانەوەی ئەو لەبیرچووانەو دەرهێنانەوە یانە لە دۆخی بیرچوونەوە.

ئەم دابەشکردنە هەمان دابەشکردنی فەلسەفەی ئایدیایە بۆ مرۆڤەکان: بەپێی فەلسەفەی ئایدیا مرۆڤەکان لە سێ توێژ پێکدێن:

١- توێژی کارکەرانی بەرهەمهێن، یاخود کۆیلەکان.

٢- توێژی سەربازان و جەنگاوەران.

٣- توێژی فەیلەسوفان و دانایان.

ئەو سیستمی فێرکردنەی لە سەرەوە باسکرا دەبێتە ئامرازێکی پاڵاوتن بۆ جیاکردنەوەی ئەم سێ توێژە، بەو پێیەی خەڵکی خاوەنی یەك ئاست نین لە ڕەوشت و ژیری، کەواتە خەڵکان پلەدارن، هەر ئەمەش لەسەر پرۆسەی فێرکردن دەسەپێنێت کە ئەم جیاکاریە بهێنێتە دی. ئەم کارەش بەمجۆرە دەرەخسێت: مەشق و ڕاهێنان و فێرکردنێکی گونجاو لەگەڵ ئاست و تواناو لێهاتوویی بدرێتە دوو توێژی کارکەران و سەربازان بۆئەوەی بە شێوازی خوازراو ئەرکەکانیان جێبەجێ بکەن، وە لەپاشاندا تەواو جەخت بکرێتە سەر ئەو فێرکردنەی کە بۆ ئامادەکردنی پاڵاوتەی ئەقڵ و هزرەکانەوە لە داهاتوودا دەبنە فەیلەسوفان و دانایان کە ئەرکی ڕابەری کۆمەڵیان پێ دەسپێردرێت، بەمەش سەروەری و هێزی کۆمەڵگا دەستەبەر دەبێت.

## ٢- ئامانجە پەروەردەییەکان لە فەلسەفەی ئایدیایدا:-

لەم فەلسەفەیەدا جەخت لەسەر پەرەپێدانی تاکە کەس دەکاتەوە لەڕووی ژیری و ئاکاری و ڕاستییە نەگۆڕاوەکان و زانینە سەرەتاییەکان و گەشتن بە ڕەوشتی ئایدیایی باڵا، چونکە ئەقڵ- ژیری- بنەڕەتی گەشتنە بە ڕاستیەکان

بەهۆی بیرکردنەوەو تێڕامان، هەر لەڕێی ژیرییەوە دەتوانین بیرۆکەو زانیارییە شاراوەکانی نێو ئەقڵ بگێڕینەوەو دەمانگەیەنێتە جیهانی ئایدیایی باڵا.

لە بەرامبەر ئەمانەی باسکران فەلسەفەی ئایدیا وەك پەروەردە لایەنەکانی دیکەی پەرەسەندنی تاکە کەسی پشتگوێ خستووە، وەك لەڕووی جەستەیی و لێهاتوویی و سنووردارێتییەوە، چونکە بە بیرو بۆچوونی فەلسەفەی ئایدیایی ئەمانە ڕێگیر دەبن لە گەشەسەندنی ژیری و پەروەردەکردنی ڕۆحدا .

هەر بۆیە دەبینین کە خوێندنی پیشەیی و پراکتیکیەکان کەنار خراون و هەموو توانای فەلسەفەو پەروەردەی ئایدیایی لە زانستە تیۆری و ئەوانەی مۆرکێکی شیکاری و ڕاڤەکردنیان هەیە خستۆتەگەڕ وەك: فەلسەفە، بیرکاری، لۆژیك ... لەپاڵ گرنگیدانی فەلسەفەی ئایدیایی بە گەشەسەندنی ژیری و بەها ڕەوشتیەکان هەوڵدەدات کۆنترۆڵی جەستە بکات لەڕێی کپکردنی غەریزەو ئارەزووە سروشتیەکانی مرۆڤ، وە فەرمانڕەوایەتی بەسەر هەستەکاندا هەبێت، سەرەڕای ئاراستەکردن و ڕێنمای ئیرادەو دەرکردنی فەرمانگەلێك ببنە هۆی ملکەچی و پابەندبوون بەو سیستمە پۆلاینەی کە فەلسەفەی ئایدیا دەیەوێت لەکاردابێت.

پاش ئەمانەی باسکران، هەندێك سزای جەستەیی بەکار دەبران بۆ جڵەوکردنی ئارەزووەکان تا توانای ژیریی و پەروەردەی ڕۆح کاراو چالاکتر بکرێت.

بەو هۆیەی سروشتی مرۆڤ لە هەموو کات و شوێنێکدا یەکە بەو پێیەی ژیریی چەند تایبەتمەندیەکی هاوبەشی هەیە لەنێو کەسەکاندا، چاکە، ڕاستی، جوانی یەکن و نەگۆڕن، ئەوا پەروەردە لای ئایدییەکان نەگۆڕە، گۆڕان بەسەر ئەم پرۆسەیەدا نایەت تا گۆڕان بەسەر کۆمەڵگاو سەردەمەکاندا نەیەت، هەر لەبەر ئەم هۆیە بەرزترین ئامانجی پەروەردە بەشێوەیەکی گشتی بریتیە لە دۆزینەوەو بەرجەستەکردنی ئەو فەیلەسوف و دانایانەی کە لەتواناياندایە تێگەیشتنیان بۆ خواست و ئیرادەی خواوەند، وە ڕاستی ئەو ئیرادەیە هەبێت و تواناو ویستی ئەو خواوەندە ئاشکرا بکەن، هەر ئەمانەش دەتوانن دادپەروەر بن و لە هەموو کەس زیاتر دادپەروەری پیادە بکەن و هەوڵی گەشەنەسەندنی بدەن.

## ٣ - پرۆگرام (بابەتەکانی خوێندن) لە پەروەردەی ئایدیادا:-

بۆ هێنانەدی ئەو ئامانجانەی پێشتر باسکران، ئەوا ئەو پرۆگرامەی ئایدیاییەکان دەخوازن لەئارادا بێت، بابەتی تیۆرین و یارمەتیدەری گەشەسەندنی ژیریی و ئاکارین لە تاکە کەسدا، ئەو بابەتانەش وەك: فەلسەفە، لۆژیك، ئاین، بیرکاری، وێژە، بەڵام بابەتەکانی زانستی ئەزموونی و پراکتیکیەکان لەم ڕێبازەدا پشتگوێ دەخرێن و وەلا دەنرێن،چونکە ئەم زانستانە بە جیهانی ماتریالی خوارەوە (العالم المادی السفلی) گرێدراون، وە گەر هەندێك بابەت لەخۆ بگرن ئەوا

بەشێکن لە زانستی ڕاستەقینەو دوورن لە بەهاکان، چونکە ناتوانن بڕیار بدەن لەسەر ئەوەی کە چ شتێك چاکە یان خراپە.

هەروەها پرۆگرامەکانی خوێندن دەبێت ئەزموون و شارەزاییە مرۆییەکان بەرجەستە بکەن، وەك ئەوانەی پەیوەستن بە ڕابردوو و کلتووری کۆنی مرۆڤایەتییەوە، بەتایبەت ئەو کتێب و دانراوانەی لەلایەن دانایان و بیرمەندانی بلیمەتەوە دانراون و نموونەی پالاوتەی هزری مرۆڤایەتین بەدرێژایی سەردەمەکان، یا دەبێت پرۆگرامەکانی خوێندن ئەو زانیاریانە لەخۆ بگرن کە یارمەتیدەرن بۆ تێگەیشتن و لێکدانەوەی ئەو ژینگە لۆکالییەی (محلی) مرۆڤەکانی تێدا دەژین، ئەمەش لەپێناو چەسپاندن و ڕەگداکوتانی هەستی ئینتیمابوون بۆ نیشتمان و نەتەوەو گەشەپێدەری ئەو هەستە بن.

پەرتووك لە فەلسەفەی ئایدیاییدا پلەی هەرە سەرەکی و بایەخی پێ دەدرێت، چونکە سەرچاوەی بیری ڕەسەن و مانای سەرتاسەری و وشە درکێندراوەکانە، ئەمانەش بالاترین ئامرازو هۆکاری گفتوگۆی ژیریی و هزرن، بەتایبەت پەرتووکە کۆنەکان و کلتوری و ڕۆشنبیرییەکان بەشێوەیەکی گشتی، چونکە ئەمانە دەبنە وروژێنەری ژیری بەهۆی دانایی و پەندەکانی مێژووەوە.

دەبێت پرۆگرامی خوێندن دەرخەرو ڕەنگدەری زانیاری کۆکراوەو ڕاستیەکان بێت، یارمەتیدەری مرۆڤ بن لە تێگەیشتنی گەردوون و خودی مرۆڤ، هەروەها هاندەر بن بۆ دۆزینەوەی زانین و زانیارییەکان، وە لەگەڵ شارەزایی و ئەزموونەکان گرێ بدرێن.

## ٤- شێوازی وانه وتنەوە لە پەروەردەی ئایدیادا :-

لەم ڕێبازە فیکریەدا پشت بە پێدانی زانیاری و وتنەوەی وانە (القاء الدروس) دەبەسترێت، پاشان شێوازی گفتوگۆو مشتومڕ بەکاردەهێنرێت بۆ گەیاندنی زانیاریەکان بە فێرخواز، لەپاشاندا ڕادەهێنرێن لەسەر لەبەرکردن و گەڕانەوەی زانیاریەکان، ئەمەش لە قۆناغی منداڵیدا، بەڵام لە گەورەییدا دەگۆڕێت بۆ شێوازی دیالۆگ و گفتوگۆکردن بۆ زیاتر فراوانکردنی ئاسۆکانی بیرکردنەوە، وە بەخشینی لێهاتوویی و توانای بیرلێکردنەوە بەجۆرێکی پەی پێبردن و هەڵێنجان.

## ٥- چالاکییە فێرکاریەکان لە پەروەردەی ئایدیادا :-

پەروەردەی ئایدیا لە چالاکییە جەستەییەکانی فێرخواز ئارام و لەسەرخۆیە، چونکە وای بۆ دەچێت ڕێگر بن لە نەشونمای ژیریی، هەروەها وا لێکدەداتەوە چالاکی زانستیانەو ڕاهێنانی هەستەکان و چالاکییە جەستەییەکان دەبنە کۆسپ بۆ گەشەسەندنی توانای ژیریی، وا بەباش دەزانرێت فێرخواز لە کاتی پشووەکانیشدا سەرقاڵ بێت بە گەڕان بۆ کۆکردنەوەی زانیاریەکان، چونکە ئەم کارە هزریان دەوروژێنێت و زانین بەدەست دەهێنێن، بەڵام جێبەجێکردنی چالاکییە جەستەییەکان ڕێدەگرن لە بێگەردی ژیریی و زانین، چونکە دەبنە هۆی بەهێزکردنی لەش و غەریزەو حەزەکان، ئەمانیش ڕێنادەن ژیریی ئەرکی خۆی بە ئەنجام بگەیەنێت.

## ٦- پلەوپایەی مامۆستاو فێرخواز لە فەلسەفەی ئایدیادا :-

لەم فەلسەفەیەدا مامۆستاو فێرخواز پلەوپایەی تایبەتیان هەیە، پلەی مەزن و باڵای مامۆستا هەڵقوڵاوی ئەو ڕۆڵە گرنگەیە کە ئەم کەسە دەیبینێت، مامۆستای نایاب سەلمێنەری سەرکەوتن و توانای زانینی لە ئاستێکی باڵادا بێت. ئەم خەسڵەتانەش دەبنە مۆرکی مامۆستایەکی لێهاتوو لە کارەکەیدا:-

* دیدێکی قوڵی مرۆڤانەی هەبێت.

* بلیمەت و خاوەن ڕۆشنبیری بەرفراوان بێت.

* نموونەی ڕابەر بێت بۆ خوێندکاران لەڕووی ژیریی و ئاکاریەوە.

* هەست بە بوونی بەهاکان بکات و لە سروشتی مرۆیی تێبگات.

* خاوەن لێهاتوویی سەرنجڕاکێش بێت و شارەزایی تەواوی لە وانەوتنەوەدا هەبێت.

* هەمیشە بتوانێت لە کارەکەیدا توانای داهێنەرانەی خۆی بسەلمێنێت.

مامۆستای باش ئەو کەسەیە کە کەشێکی تەندروست دەڕەخسێنێت بۆ پەرەدان بە توانا شاراوەکانی منداڵ و یارمەتیدەری بێت بۆ زاخاودانی ئەو تواناو لێهاتووییە لە کەشێکی ئازادو سەربەخۆدا، ئارامی و هێمنی و ڕێزو ڕەوشتە ڕێك و جوانەکان بەرجەستە بکات تا فێرخواز بگاتە ئەو پەڕی کامڵبوون، ئەم کارانەش بە یارمەتی و هاوکاری خودی فێرخوازان ئەنجام دەدات، هەر ئەمانەن پلەوپایەی مامۆستا مەزن و باڵا ڕادەگرن، ئەم خەسڵەتانەش لەتوانای هەموو

کەسێکدا نین، بۆیە مامۆستایی دەبێتە ئەو کارەی هەموو کەس نەتوانێت پێی هەستێت.

بەڵام سەبارەت بە فێرخواز (خوێندکار) هەڵوێست و ڕۆڵی نێگەتیڤانەی هەیە لە فەلسەفەی پەروەردەی ئایدیادا، چونکە وا دەخوازرێت لە فێرخواز هەمیشە ملکەچ و جێبەجێکەری ئەو هەموو یاسا تونلوتیژانەی خوێندنگا بێت، فێرخواز هەنگاو بە هەنگاو پلە بە پلە دەتوانێت توانا شاراوە سروشتیەکانی خۆی بدۆزێتەوەو زاخاویان بدات بە شارەزایی و لێهاتووی کەسانی پێش خۆی.

ئەوەی تێبینی دەکرێت: فەلسەفەی پەروەردەی ئایدیا بەدرێژایی مێژوو لە هەموو شارستانیەکان و وڵاتە جیاوازەکاندا کاریگەری لەسەر هەموو جۆرەکانی دیکەی پەروەردەدا هەبووە، بۆ نموونە وڵاتانی عەرەبی و ئیسلامی بەهێزی و بەردەوامبوونی ئەم کاریگەرێتیە دەگەرێتەوە بۆ بەهێزی و توانای بیرو ئەندێشەکانی ئەم ڕێبازە، جگە لە نوێکردنەوەی بەدەوام و خستنەسەری زیاتر بۆ سەر بیرۆکەو بۆچوونەکان لەلایەن بیریاران و فەیلەسوفانی داهێنەر. ئەم کاریگەرێتیە تا ئێستاش لەم سەردەمەدا بەردەوامە.

## دووەم:- فەلسەفەی پەروەردەی ڕیالیستی (الواقعية):-

فەلسەفەی ڕیالیستی بۆ بەرپەرچدانەوەی دیدو بیرو بۆچوونەکانی فەلسەفەی ئایدیالی هاتە ئارا، جیاوازیەکی بنەڕەتی و ڕیشەیی لەنێوان ئەم دوو ڕێبازە فکریەدا هەیە، بۆ نموونە گەر فەلسەفەی ئایدیالی نکوڵی لە جیهانی ماتریالی دەکات و تەنها جیهانی بەپێی بۆچوونی ئایدییەکان هەر جیهانی نموونەو ڕەوشتە جوان و ئایدیاکانە، وە جیهانی سروشتی دابڕاو نیە لە مرۆڤ و ڕاستیەکەی لەنێو خودی مرۆڤ یا ژیریدا، بەڵام فەلسەفەی ڕیالیستی تەواو پێچەوانەی ئەم بۆچوونانە بوو، بڕوای تەواویان بەو بوونە ماتریالە هەسپێکراوە هەبوو کە بە چاو دەبینرێت و بوونێکی سەربەخۆی هەیە لە ژیریی و نموونە بالاکان. هەر ئەم بوونە واقعیە سەرچاوەی هەموو ئەو ڕاستیانەیە لەنێو شتەکاندا شاراوەن نەک لەنێو هزرەکاندا وەك ئایدیاکان وای بۆ دەچوون.

شت (الشيء) بوونی هەیە گەر ئێمە بیرۆکەیەکمان هەبێت، یاخود نەبێت، وە بوونی ئەم شتەش سەربەخۆو دابڕاوە لەو بیرۆکەیەی کە تایبەتە بە هەبوونی، یاخود نەبوونی. ژیریی وچالاکیەکانی هەڵقولاوو شوێنکەوتەی ماتریالن، جیهانی سروشتیش چ شتێك نیە جگە لەوەی ژیریمان درکی پێدەکات و جیهانی ئەزموونە مرۆییەکان بە شارەزایی و لێزانیەوە دەیگوزەرێنن، بەمەش مانای ڕیالیستی ڕوون دەبێتەوە بەشێوەیەکی سادەو ساکار، واتا:- ئەوەی کە هەیە، وە

ڕاستیش وێنە و دیاردەی ئەم بوونەیە، پێوەری ڕاستی بریتییە لە ڕادەو بڕی پراکتیزەبوونی بەسەر واقعدا.

سەرچاوەی دامەزراندنی ئەم ڕێبازە فەلسەفیە دەگەڕێتەوە بۆ (مامۆستای یەکەم) واتا ئەرستۆ (٣٨٤-٣٢٢ پ.ز) بناغەی سەرەتایی ئەم ڕێبازەی داڕشتووە بەناو ڕیالیستی، وە یا لەگەڵ چەند ڕایەکی دیکەدا بە ڕیالیستی کلاسیکیانە نێوزەد دەکرێت. دەتوانین بۆچوونەکانی ئەرستۆ سەبارەت بە جیهان و سروشتی مرۆیی بەجۆرە کورت بکەینەوە:- ئەرستۆ وای بۆ دەچێت کە جیهان خاوەنی خەسڵەتێکی جمکی (دووانەیی)یە، کە دابەش دەبن بەسەر: ١- ماتریاڵ (المادە)،٢- وێنە، ڕووخسار. ماتریاڵ ئەو هەوێنە، یا ئەو کەرەستە خاوەیە کە هەموو (شت)ەکان تێیدا بەشدارن و هەمیشە ماتریاڵ لە گۆڕان و شەقڵ وەرگرتندایە، بەڵام وێنە- ڕووخسار بریتییە لە شێوازی کۆتایی شتەکان بۆیە جێگیرو نەگۆڕە، هەموو شتێکیش ڕووخسارو ماتریاڵی هەیە،لە لوتکەو ترۆپکی هەموو شتەکانیشدا ژیریی هەیە.

ئەرستۆ سروشتی مرۆیانە دابەش دەکات بە سێ دۆخ:-

١. دۆخی، یا باری دامەزراندنی پێکهاتەی ئەندامی جەستەیی دەگرێتەوە لە قۆناغی منداڵیدا.

٢. دۆخی هەستیاری یا غەریزی (خۆڕسکی)

٣. دۆخی سێیەمیش هێزی بە قسەهاتنە، یاخود قۆناغی ژیری (هێزی گۆینده- القوى الناطقة). هەر بۆیە ئەرستۆ جیاوازی کردبوو لەنێوان دوو جۆر لە ژیری ئەوانیش: ژیریی تیۆری و ژیریی پراکتیکین.

جۆری یەکەمیان بەوە دەناسرێتەوە کە ژیرییەکی زانینی پەتیە، ماوەیەکی زۆر دەخوازێت تا دەگاتە گەشتن بە زانیارییەکان و تێڕامان لە سروشتی بیرۆکەکان، ئەمەش فرەیی و لێشاوی خوداوەندییە (الفيض الالهي)، بەڵام ژیری پراکتیکی تایبەتە بە دوو دۆخەکەی چالاکی مرۆیانەی یەکەم و دووەمەوە کە پێشتر ئەرستۆ ئاماژەی پێدابوون، ئەم ژیرییەش سەرکێشی و هەڵچوونی حەزو ئارەزووەکان جڵەوو سنووردار دەکات و ڕێنمایی و ئاراستەکەری دەربڕینی مرۆیانەی ساغ و تەندروستە لە بواری ڕەفتارو ئاکارەکاندا.

بەهۆی ئەو خەسڵەتە جەمکی (دووانەیی) ەی جیهاتەوە زانستیش دابەش دەبێت بەسەر دووجۆردا: ١- زانستی تیۆری ٢- زانستی پراکتیکی. یەکەمیان گەڕان و لێکۆڵینەوەیە بەسەر سەرتاسەرێتی هۆ یەکەمینەکاندا (العلل الاولى)، سەرەڕای گەڕان بەدوای ڕەهاو هەتاهەتایی ... بەو جۆرەی دوا مەبەستی زانیاریەو باڵاترین خاڵیش دانایی و فەلسەفەیە. کەواتە زانستی تیۆری دەبەسترێتەوە بە شکۆو بڵندی ژیرییەوە، بەڵام زانستی پراکتیکی گەڕانە بەشوێن ئەو پەرت و بەشە وردانەی کە لە سنوری سەرتاسەرییدا هەن، ئامانجی ئەم زانستەش بەڕێوەبردنی ڕەفتاری مرۆڤ و فەرمانڕەوایەتیکردنیەتی. وە زانستی

پراكتیكی گرێدەدرێتەوە بە شكۆو بلندی ژیریی پراكتیكیانە كە ڕێكخەری ڕەفتارو ئاراستەكەری ئەركەكانە.

ئەوەی لە بۆچوونەكانی ئەرستۆ تێبینی دەكرێت بەرجەستەبوونی كاریگەری بیری ئیفلاتونە، چونكە وەك دەزانین ئەرستۆ قوتابی ئیفلاتون بووە، بەڵام ئەرستۆ بەپێچەوانەی مامۆستاكەیەوە (واتا ئیفلاتون) هەژموونی ڕیالیستی ژیریانە، واتا ماتریاڵی بەسەر بۆچوونەكانیدا زاڵبووە، كە ئەمەش كاریگەری زۆری بەسەر پەروەردەی ڕیالیستی جێهێشتووە، ئەویش لە ڕێگەی بایەخدان بە زانستە سروشتی و ئەزموونیەكان، هەرچەندە ئەو ڕەوشتە باڵایانەی ژیریی دركیان پێدەكات دوا ئامانجی پەروەردەن بەپێی بۆچوونی ڕیالیستی وەك پاشتر بۆمان ڕوون دەبێتەوە.

فەلسەفەی ڕیالیستی لە سەدەكانی ناوەڕاستدا گۆڕانی بەرچاوی بەخۆیەوە دیوە، بۆ نموونە سەرهەڵدانی ڕێبازی ئاینی لەسەر دەستی (تۆما ئەكوینی)، یاخود لە سەردەمی ڕێنیسانسداو دواتر ئەم ڕێبازە بەگوڕتر بەرەوپێشچوو لەو كاتەی هەژموونی هیومانیستی و كۆمەڵایەتی ئەزموونگەری باڵادەست بوون، پاشانیش تەوژمی زانستی و سروشتی، بەمەش فەلسەفەی ڕیالیستی چەندەها لایەنی فیكری بەخۆوە بینیوە نەك تەنها بەمەستی تێڕامان و وردبوونەوە، بەڵكو بۆ ڕاڤەكردن و لێكدانەوەو گۆڕینی واقع كاریان دەكرد،ئەم فەلسەفیە لەسەر

شێوازی چەند تەوژم و ڕێبازێکی هزریانە بەرجەستە بووە کە دەتوانین لەم خاڵانەدا کورتیان بکەینەوە:-

١- تەوژمی ڕیالیستی مرۆڤگەرایی (هیومانیستی) ئەمیش لە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی کۆندا ئاشکرا بوو.

٢- تەوژمی ڕیالیستی کۆمەڵایەتی، ئەمیش لە لێکۆڵینەوەی کۆمەڵایەتیانەدا بەرجەستە دەبوو، هەروەها ڕۆڵی پەروەردە لە پرۆسەی چاکسازیدا.

٣- تەوژمی ڕیالیستی هەستگەرایی (الحسی) ئەمەیان لە لێکۆڵینەوەی دیاردە سروشتیەکاندا ئاشکرا دەبوو، ئەویش بە بەکارهێنانی هەستەکان لەڕێی ئەزموونەکانەوە، سەرەڕای بەکارهێنانی هەڵێنجانی یاساکان (**الطرق الاستقرائیة**).

٤- تەوژمی ڕیالیستی سروشتی لە لێکۆڵینەوەی زانستە سروشتیەکانەوە دەرکەت.

٥- دوای ئەم تەوژمانە ڕیالیستی زانستیانە (الواقعیة العلمیة) سەریهەڵدا کە لەسەر ڕێبازی بابەتیانەیی زانست بەڕێوەدەچوو بۆ دەرخستن و دۆزینەوەی ئەو یاساو ڕاستیانەی جیهان بەڕێوە دەبەن.

هەروەها ڕێبازی ڕیالیستی لە وێنەکێشان و هونەرو چەندەها بواری دیکەشدا دەرکەوت، جگە لە چەند تەوژم و شەپۆلێکی دیکە دەچوونەوە نێو سنورەکانی

ڕیاڵستی. بەهۆی ئەو گۆڕانی تیژڕەوو خێرایانەی سەدەی نۆزدەو بیستەوە چەندین لق و ڕێبازی ڕالیستی جۆراوجۆر هاتنە کایەوە:- ڕیالیستی ئایینی، ڕیالیستی ماتریاڵی، هەندێجاریش لە ئایین لادەرو بێ باوەڕی، قوتابخانە فیکریەکانیش ئەمانەبوون:- ڕیالیزمی ئەقڵانی، ڕیالیزمی سروشتی، ڕیاڵیزمی ڕەخنەیی، ڕیالیزمی نوێ، ئەمیان بڕوای بە پراکتیزەکردنی میتۆدی زانستە نوێیەکانە بەسەر کێشەو گرفتە فەلسەفیەکان، زوربەی ئەوژمە فەلسەفیەکان سەر بەم ڕێبازەن کە گرنگترینیان: ماتریالیزمی بوونگەرایی و شیکاری و چەندەها ڕێبازی دیکە. ناودارترین فەیلەسوفانی ڕێبازی ڕیالیستی جگە لە (ئەرستۆ و ئیبن سیناو فارابی و ابن الهیثم) لای مسوڵمانان، وە (فرانسس بیکۆن، جۆن لۆك، دایڤد هیوم، هاربر سرینسەر، ڕاسل) لە ئەوروپا. لەم ناوانەدا ڕوون دەبێتەوە کە فەلسەفەی ڕیالیستی لە فیکری ئەوروپی و ئەمریکیدا بەربلاوو ئەشەنە سەندوو بووە.

دەتوانین بەکورتی گرنگترین ئەو بنەمایانەی کە زوربەی ئەو فەیلەسوفانە بەیەك دەگەیەنێت لەم خاڵانەدا بخەینەڕوو: ١- جیهانی ماتریاڵ بوونێکی سەربەخۆی هەیە لە هزر. ٢- تەواوکەری نێوان هەستەکان و ژیری. ٣- ئاوێتەکردنی نێوان جەستەو ژیریی. ٤- زانین پرۆسەی دۆزینەوەی جیهانی ماتریاڵە. ٥- خەسڵەتی ئەم جیهانە نەگۆڕانە. ٦- پێوانەیی بەها کۆمەڵایەتیەکان.

## پراکتیزەکردنی پەروەردەییانە لە فەلسەفەی ڕیالیستدا

دەتوانین بەکورتی پراکتیزەکردنی فەلسەفەی ڕیالیستی لە بواری پەروەردەدا بەم خاڵانە ڕوون بکەینەوە:-

١- ڕێکخستنی ژینگەی فێرکردن ٢- ئامانجەکان ٣- بابەتەکان ٤- شێوازی وانەوتنەوە ٥- پلەوپایەی مامۆستا.

### ١- ڕێکخستنی ژینگەی فێرکردن:-

هزری فەلسەفەی ڕیالیستی لە پێکهێنانی سیستمێکی فێرکردندا ڕەنگ دەداتەوە لەگەڵ بنەما سەرەکیەکانی ئەم ڕێبازە فیکرییە سازگارو گونجاوبێت، بە شێوازێك قۆناغە جیاوازەکانی خوێندن لەگەڵ قۆناغی گەشەسەندنی تەمەن و توانای فێرخواز لەبار بێت، وەڵامدەرەوەی پێویستیەکانی فێرخوازو کۆمەڵگاش بێت لە هەمان کاتدا، کارێکی لەم جۆرەش خوێندنگای زانستی و پیشەیی و پراکتیزییەکان دەخوازێت، هەروەها بایەخدان بە زانستە جۆراوجۆرەکانی وەك:- تیۆری،پراکتیکی، سروشتی، بایۆلۆجی، کۆمەڵایەتی، دەروونی کە ئەمانە هەموو بەشدار دەبن لە پەروەردەکردنی جەستەیی و ژیریی و سۆزداریی، لەبەر ئەم هۆیانە ئەم تیۆرە پەروەردەییە بەرفراوانتر بوو بۆ ڕێکخستنی سیستمی خوێندن لە دەزگاو دامەزراوە فێرکاریەکان، هەروەها ئاراستەی توێژە جیاوازەکانی دانیشتووان کراوە.

## ٢- ئامانجە پەروەردەییەکان:-

چەند جیاوازی و لێکنەچوونێك لەنێوان باڵەکانی سەر بە ڕێبازی ڕیالیستدا هەن ئەوانیش سەبارەت بە ئامانجە پەروەردەییەکانن، ئەم هۆیەش دەگەڕێتەوە بۆ بەرەوپێشچوونی بەردەوامی ئەم ڕێبازە بەدرێژایی سەدەکان، وە گۆڕان و جیاوازی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری لە کۆمەڵگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگەیەکی دی، هۆیەکی دیکەش بۆ ئەم لێکنەچوونە زیادبوونی بیرۆکەی نوێ و خستنە سەری زانیاری تازە لەلایەن هەندێ فەیلەسوفی نوێگەری سەر بەم ڕێبازە کە لەپێناو وەدەستهێنانی سودو بەرهەمێکی زیاتر بۆ ئەم یا ئەو وڵات، بەڵام لەگەڵ ئەو لێکنەچوون و جیاوازیانەدا کۆدەنگیەك سەبارەت بە ئامانجە گشتیەکانی پەروەردە لە ڕێبازی ڕیالیستدا هەیە، ئەم کۆدەنگیەش خۆی لە پەرەدان و گەشەسەندنی کەسایەتی مرۆڤدا دەبینێتەوە لە هەموو لایەنەکانی ژیری وجەستەیی و سۆزداریی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و ئاکارییەوە، لەپێناو وەدەستهێنانی یەکەیەکی تەواو بەپێی ڕەهەندە جیاوازو چالاکییە کۆمەڵایەتیە جۆراوجۆرەکان ئەم کارەش بەجۆرە دێتە دی کە ئەو زانیاریانەی تەواوکەری یەکترن و پێداویستی ژیانن لە جیهانێکی ئاساییدا بگەنە فێرخواز تا گەشە بدرێتە شارەزایی و لێهاتوویی پێویست لە ژیانیداو بتوانێت کارلێك و ئاوێتە بێت بە کۆمەڵگا، ئەو زانیاریانەش ببنە سەرچاوەیەك بۆ بەخشینی بەهاو

ڕەفتارو ناکار بەهۆیانەوە مرۆڤ بتوانێت لەگەڵ ژینگە کۆمەڵایەتیەکەیدا بسازێت.

ئامانجی پەروەردەیی لەم ڕێبازە فیکریەدا خەسڵەتی ڕامکردن و نەرمیان تێدایە بەشێوەیەکی گشتی واتا هەر کۆمەڵگایەك دەتوانێت بەو جۆرەی دەیخوازێت دایانبڕێژێت و کاریان لەسەر بکات بەشێوازێك لەگەڵ بارودۆخ و پێداویستیەکانی ئەو کۆمەڵگایەدا لەبارو گونجاو و سازگار بن بە کلتوری ئەو کۆمەڵگایە، چونکە دوا مەبەست و ئامانجی ئەم فەلسەفەیە پەرسەندنی تاکی کۆمەڵگایە لە هەموو ئەو ڕووانەی پێشتر ئاماژەیان پێدرا، دەرەنجامیشیان هێنانەدی ژیانێکی ئارام و پڕ سەروەری دەبێت.

## ٢- پرۆگرام ( بابەتەکانی خوێندن ):-

ئاساییە گەر پرۆگرام ناوەڕۆکی بابەتەکانی خوێندن ڕەنگدەرەوەی ئامانجەکانی فەلسەفەی ڕیالیستی بن، لەم جۆرە پەروەردەیەدا پرۆگرام، یا بابەتی خوێندن هەموو ئەو شتانە لەخۆ دەگرن کە لە ( بوون)دا هەن لەوانەش:

تێڕوانینی کەسایەتی مرۆڤ و پەروەدان بە هەموو لایەنەکانی ئەم کەسایەتیە ئەمیش لەڕێی گۆشەنیگا جیاوازەکانی کۆمەڵگەو چالاکیەکانیەوە، هەر ئەمەش وا دەکات ئەم پرۆگرامە پێداویستیەکانی فێرخوازو هۆکارەکانی گەشەسەندنی هەمە لایەنەی کەسایەتی و واقعی کۆمەڵگا لەخۆ بگرێت.

بە بۆچوونی فەلسەفەی ڕیالیستی دەبێت پرۆگرامی خوێنـدن ئـەم لایەنانـە لەخۆ بگرێت:

* زانستە سروشتیەکان وەك فیزیا، کیمیا.
* زانستی پەتی و پراکتیزەیی وەك بیرکاری، ئەندازە، پزیشکی...
* زانستـە کۆمەلایەتیەکان وەك مێژوو، کۆمەڵناسی، دەروونناسی...
* بابەتـە هونەریەکان وەك شانۆ، موزیك، شێوەکاری...
* بابەتی پەروەردەیی جەستەیی وەك یاری، ڕاهێنانی جەستەیی، مەشقکردن...

جگە لەم بابەتانە خوێندن لە فەلسەفەی ڕیالیستیدا بەجۆرێك بەرفراوان بوو نەك تەنها کتێب و چاپەمەنیەکانی دەگرتەوە، بەڵکو پەلی کێشا بـۆ ژینگـەی لۆکاڵی و چالاکیە ڕۆشنبیری و کۆمەلایەتی و هونەرکاریش، سەرەڕای ئەمانـە پرۆگرام لەم فەلسەفەیەدا دەتوانێت چاکسازی تێدا بکرێـت، گـۆڕانی بەسـەردا بهێنرێت، جا بە زیادکردن بێت، یاخود بە لابـردن بێـت بـەپێی ئـەو زانیاریـە نوێیانەی لە کایە زانستیەکاندا دەدۆزرێنەوە، هەروەها بەپێی ئەو گۆڕانکاریانەی بەسەر کۆمەڵگادا دێن، ئەمانەش دوابەدوای خۆیان پێداویـستی گۆڕانکـاری و دەستکاریکردنی بابەتەکانی خوێندن دەخوازن تا بەرەوپێشچوون و گەشـەندن لەسەر یەك ڕیتمی هاوتەریب لەگەڵ خواست و پێداویستیەکانی ژیانی کۆمەڵگە گونجاوو لەبار بێت.

## ٤- شێوازی وتنەوە:-

شێوازی وانەوتنەوە لە فەلسەفەی ڕیالیستدا پشت دەبەستێت بە دیالۆگ و گفتوگۆکردن بۆ گەیاندنی زانیاریەکان، هەروەها ئەزموون و تێبینی هەڵێنجان و پشت بەستن بە شێوازەکانی بینراوو بیستراوو سەردان و گەشتەکان، ئەمانە ئەو توانایە لای فێرخواز دروست دەکەن کە بەهۆیانەوە زانیاریەکان بگێڕنەوەو ڕاڤەیان بکەن و لێکدانەوەو شیکردنەوەی بابەتیانەیان بۆ دابنێن بۆئەوەی پەیوەندی نێوان زانیاریەکان و وەدەستهێنانی مانای تازەی لێوە فێر بن، بواری کراوەش هەیە تا ئەو شێوازانە بەکارهێنێت کە سەرنجی فێرخواز ڕابکێشێت و حەزو ئارەزووەکانیان تێر بکات بەجۆرێك وروژاندنێك لای فێرخوازەکە دروست بکەن کە ژینگەی ئەو ڕێسا سروشتیانەی جیهان و بارە کۆمەلایەتیەکان لێکدەدەنەوەو تێگەشتن و ڕاڤەکردنیان بۆ بکەن.

## ٥- پلەوپایەی مامۆستا:-

مامۆستا لەم ڕێبازەدا پلەو پێگەیەکی مەزنی هەیەو دەسەڵاتی باڵای دەدرێتێ بەجۆرێك بتوانێت پێکهاتەکانی پرۆگرام و بابەتی خوێندن تاقی بکاتەوەو هەڵسەنگاندنیان بۆ بکات و وەك ئەرکێك بیداتە فێرخوازان. هەر مامۆستاش شێوازی پاداشت و ڕێزلێنان بەکاردەهێنێت وەك هاندەرێك بۆ پاراستنی سیستمی خوێندن و بەخشینی گورو تینی نوێ بۆ فێرخوازان تا هانیان

بدات بۆ بەدەستهێنان و کۆکردنەوەی ئەو خوو نەریتانەی دەخوازرێت لە پرۆسەی خوێندندا هەبن.

بەو هۆیەی مامۆستا پسپۆڕەو شارەزایی لە زانستە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکاندا هەیە، کەواتە لەتوانایدایە فێرخوازان ڕێنمایی بکات

بۆ دۆزینەوەو زانینی ڕێسا گشتیەکان و ڕەوشتە بەرزو باڵاکان، هەر مامۆستایە فێرخوازان دەوروژێنێت بۆ ئەنجامدانی چالاکی و ئەزموون و ڕاهێنان، هەروەها بۆ خوێندنەوەی دیاردە سروشتیەکان، مامۆستا جەخت لەسەر ئازادی و سەربەخۆیی فێرخوازان دەکاتەوە لە پێگەیاندنی تواناکانیان و دەبێتە ئاڕاستەکەرو ڕێنیشاندەرو فێرخوازەکانی لەسەر پێوەری ڕەوشتە مرۆییەکان ڕادەهێنێت، چونکە هەموو ڕەوشتێکی باڵاو نموونەیی لەرێی فێربوونەوە وەدەست دەهێنرێت.

## سێیەم:- فەلسەفەی پەروەردەیی پراگماتیزم Pragmatism

دادەنرێت بە گرنگترین و بەناوبانگترین ئەو فەلسەفانەی کە لە سەدەی بیستەمدا هاتوونەتە ئارا، ئەم ڕێبازە فیکریە لە وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا گەشەی سەندووە، چونکە ژینگەیەکی لەبارو گونجاو بووە، ناوبانگی ئەم فەلسەفەیە سەرتاسەری جیهانی گرتەوە، تەنانەت بووە فەلسەفەی سەرەکی و

بنەڕەتی لە بواری پەروەردەدا نەك تەنها لە ئەمریکا، بەڵکو لە زۆرێك لە وڵاتانی دیکەی جیهان.

سەرەتا بە شیکردنەوەی مانای پڕاگماتیزم (**Pragmatism**) دەست پێ دەکەین، ئەم وشەیە دەقاودەق مانای پڕاکتیکی، یاخود کردار لە کاتی جێبەجێکردندا دەگەیەنێت، کەواتە دەتوانین بەپێی لێکدانەوەی ئەم مانایە لەڕووی زمانەوانییەوە بگەینە مانای زاراوەیی

(المعنى الاصطلاحي) ئەم دیدە فەلسەفیە، ئەویش بە وردبوونەوە لەو مەبەستەی دامەزرێنەرانی ئەم ڕێبازە فکریە ئامانجیان بووە.

بەکارهێنانی وشەی پڕاگماتیزم بە سێ قۆناغدا تێ پەڕیوە کە پەیوەستن بە دامەزرێنەرانی ئەم ڕێبازە فەلسەفیە، چونکە هەریەك لەو فەیلەسوفانە گۆشەنیگایەکی تایبەتی هەبووە لەنێو ڕێچکە فەلسەفیەکەدا:- یەکەمین فەیلەسوف ئەم وشەیەی بەکارهێنابێت (تشارلز پێرسی ١٨٣٩ – ١٩١٤) بووە، بەو مانایەی: «کاری بەرهەمدار پێوەری ڕاستی و دروستی ڕاکان دەربارەی سودی ئەو ڕاستیەن»، بەڵام (ویلیەم جیمس ١٨٤٣ – ١٩١٠) ئاڕاستەی بیرکردنەوەی خۆی ڕووی لە (کارو داهاتوو) کردبوو، ئەو وای بۆ دەچوو پێوەری ڕاستەقینەی گوتراو ئەو دەرەنجامانەیە کە لە هەڵسوکەوت و باشترکردنی ژیانی گشتیماندا بەدەستی دێنین.

(جۆن دیوی ۱۸۵۹ — ۱۹۵۲) بە دامەزرێنەری ڕاستەقینەی فەلسەفەی پراگماتیزم دادەنرێت، دوو زاراوەی جیاوازی بەکارهێناوە: یەکەمیان: (ڕێبازی ئامرازی)، یاخود هۆکاری، مەبەستی لەم زاراوەیەش بەهای ئەرکدارێتی ژمێرییە.

دووەم: زاراوەش (ڕێبازی ئەزمونگەری)ە، مەبەستی لەمیان ئەو شارەزایی و لێزانینەیە بۆ وەدەستهێنانی زانیاری و چارەسەری ئەو کێشانەی دێنەسەر ڕێگەی تاك و کۆمەڵ.

هەر ئەمەش بوو وای کرد لایەنگرانی فەلسەفەی پراگماتیزم بۆ وردبوونەوە لە مانای ئەم ڕێبازە، بەپێی ئەو گۆشەنیگاو تایبەتمەندێتیە ئەنجام بدەن، بۆیە لەلایەك ناونرا (فەلسەفەی پراکتیکی)، چونکە جەختکردنە لەسەر بەهای کارکردن و چالاکی لە وەدەستهێنانی زانیاری، وە لەلایەکی دیکەوە ناونرا (فەلسەفەی ئامرازی)، چونکە دیدی ئەم فەلسەفەیە بۆ زانیاری، شارەزایی، (شت)ەکان، وە دانانی ئەمانە بە هۆکاری جەختکردنەوە لەسەر بایەخ و گرنگی شێوازی ئەزموونگەری بۆ وەدەستهێنانی زانیاری و چارەسەری گرفتەکان.

ئەم تێڕوانین و بۆچوونە جیاوازانەی نێو ئەم فەلسەفەیە ناکاتە دژایەتی و پێچەوانە، یاخود بەو مانایە نیە ئاراستەی دوور لەیەك و دژ بوونیان هەبێت، بەڵکو ئەمانەی کە هەن و شێوازی جۆراوجۆریان گرتۆتە بەر لە هەناوی ئەم

ڕێبازە فکریەدا هەموو بەیەکداچوو و پێکەوەگرێدراوی ئەو بنەما سەرەکیانەن کە دامەزرێنەرانی ئەم فەلسەفەیە دایان ڕشتووە.

ئەم چوارچێوە گشتیەو هەموو ئەو فەیلەسوف و پەروەردەکارانەی سەر بە ڕێبازی پراگماتیزمن، هەرچەند بۆ چوون و دیدی جیاوازیان هەبووە، بەڵام کۆدەنگیەك لەسەر مانای گشتی ئەم فەلسەفەیە هەیە ئەویش: »هەموو چالاکیەك ئەوە دەخاتە ڕوو کە سروشت و کۆمەڵگا سنووردار نین و لە بنەڕەتدا هەردووکیان ناتەواون، پێویستیان بە چاککردن و گەشەپێدان هەیە«. وە باوەڕ بەبەهای کارکردن و ئەزموون وەك سەرچاوەیەك بۆ زانیاری لەپێناو چارسەری کێشەکانی کۆمەڵ و چاکسازی و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگایە.

لە پێناسەکەی (جۆن دیوی) بۆ ئەم فەلسەفەیە، وا دەردەکەوێت بابەتی زانست ماهیەتی شتەکانەو چۆنیەتی ڕێکخستنیانە لە پەیوەندیەکاندا، بەڵام بابەتی فەلسەفە بریتیە لە ماهیەتی بەهاکان و چۆنیەتی داڕشتنەوە یان و پێگەی ئەم بەهایانە لە ڕێکخستنی شارەزاییەکاندا. ئەو وای بۆ دەچێت ئەرکی فەلسەفە ڕزگارکردنی ژیریمانە کە لایەنگیری و ناسینی جیهانمان بۆ بخاتەڕوو، هەروەها چۆنیەتی چارسەری کێشەکانی کۆمەڵ و هەوڵی بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگا بدەین.

## بنەماکانی فەلسەفەی پراگماتیزم:-

١- بنەڕەتی جیهان هەمەڕەنگی و فرەییە.

٢- ناوەڕۆکی جیهان گۆڕانکاریەکی بەردەوامە.

٣- یەکێتی سروشتی مرۆیانەو تەواوکاری بوونی.

٤- ئامڕازگەرایی زانین و ئەرکەکانی.

٥- ڕێژەگەری بەهاکان.

٦- بەهای ڕاستەوخۆ ( دەم و دەستی) لە ئەنجامگیریدا.

٧- دیموکراسی شێوازی ژیانی نموونەییە.

٨- میتۆدی زانستی شێوازی بیرکردنەوەی نموونەییە.

## ١-پراکتیزە پەروەردەییەکانی فەلسەفەی پراگماتیزمی

پشت بەستن بەو بنەما فەلسەفیانەی کە پێشتر بە خاڵ خرانەڕوو، دیدی ئەم ڕێبازە فکرییە سەبارەت بەپەروەردە ڕوون دەکەنەوە، بەتایبەت بۆچوونەکانی جۆن دیوی. ئەم پێی وایە پەروەردە نەک ئامادەکارییە بۆ ژیان، بەڵکو خودی پرۆسەی ژیانە، بەو مانایەی پرۆسەی گەشەسەندن و فێرکردن و فێربوون و نوێبوونەوەی بەردەوامی شارەزاییەکان، وە پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتیشە، بۆ ئەوەی پەروەردە بکرێتە پرۆسەی ژیان، ئەوا پێویست دەکات کە گرێدراوی مەسەلەکانی

ژیان بێت، ئەوا پێویستە وشیارو ئاگادار بێت بە مەرجەکانی گەشەسەندن و فێرکردن و بەدەستهێنانی شارەزاییەکان، وە بۆئەوەی پرۆسەیەکی کۆمەڵایەتی بێت ئەوا دەخوازرێت ئاوێتەبوون و کارلێکی کۆمەڵایەتیانە لەخۆ بگرێت لە کەش و هەوایەکی دیموکراسیانەی تەندروستدا.

بەو هۆیەی پەروەردە مانای ژیانە، ئەوا پەروەردەیەکی ڕاست و دروست لەڕێی شارەزاییەوە دێتەدی، شارەزاییەك بەسودو پشت بەستوو بە کارلێك و ئاوێتەبوونی تاك بە کۆمەڵەوە لەپێناو بەردەوامی گەشەسەندنی تاکە کەس و ڕوودانی گۆڕانکاری خوازراو لە ڕەفتارەکانیدا، ئەم جۆرە شارەزاییەش پێویستی بە بەردەوامی لەخۆگرتنی کارلێکی تەندروست هەیە تا لەتوانایدا بێت یەك بەدوای یەك شارەزایی نوێ و کاریگەر فەراهەم بکات، واتا ئاوێتەبوونی خواستەکان و پاڵنەرە دەروونیەکانی تاکە کەس و ئەو بارودۆخەی تێیدا دەژی بەو جۆرەی سەرکەوتن بەدەست بهێنێت لەنێوان ئەم دوو لایەنەی باسکران.

بەمجۆرەش پەروەردە دەبێتە ئەو شێوازە زانستیەی تاکە کەس بەهۆیەوە پەرە بەخۆی دەدات و دەبێتە خاوەن سەرمایەیەکی بەهاو ماناکان، ئەمانەش یارمەتیدەری دەبن لە نوێکردنەوەی شێوازی ژیانی خۆیدا.

بەرجەستەکردنی بایەخ و گرنگی پەروەردە، هەروەها بانگهێشتی فەلسەی پراگماتیزم بۆ دیموکراسی بوونی پرۆسەی خوێندن و فێربوون، دەرەنجامەکەی سەپاندنی فێربوونی گشتی بوو، وە کرایە پرۆسەیەك گشت کەسێك بەشداری تێدا

بکات، سەرەڕای بەخۆڕاییبوونی خوێندن بۆ هەموو تاکەکانی کۆمەڵگا، ئەمەش دەروازەکانی خوێندن و فێربوونی خستە سەر پشت بۆ هەموو ئەو کەسانەی دەیانەوێت خوێندەوار بن.

## ٢-ئامانجە پەروەردەییەکان لە فەلسەفەی پراگماتیزمدا:-

بەو هۆیەی پەروەردە دادەنرێت بە پرۆسەی ژیان، ژیانیش ناجێگیرو گۆڕاوە، کەواتە ناکرێت پرۆسەی پەروەردە ئامانجی سنورداروو دیاریکراوی چەسپیوی هەبێت، هیچ ئامانجێکیش لە دەرەوەی خودی ئەم پرۆسەیەدا بوونی نیە، ئامانجی هەرە باڵای پەروەردە فەراهەمکردنی بەردەوامی هەمیشەیی بوونی پەروەردەکردنە. بە دەربڕینێکی تر ئامانجی پەروەردە یارمەتیدانی تاکە کەسە بۆ بەردەوامبوونی ئەم تاکە لەسەر پەروەردەو فێربوون و گەشەکردن و ڕاهێنانی لەگەڵ ژینگەو ژیاندا. ئامانجی کۆمەڵایەتیانەی پەروەردەش بریتیە لە بەدەستهێنانی ڕێکخستنی باشترو لەبارتر بۆ ژینگە.

ئەمە ئامانجی پەروەردەییە بەپێی ڕێبازی فەلسەفەی پراگماتیزم، چەند ئامانجێکی تایبەتیش هەن، کە هەڵقوڵاوی نێو هەڵوێستی شارەزایی بوونی پەروەردەییە، هەر هەڵوێستێك لەمانە ئامانجی تایبەت بە خۆی هەیە، بەجۆرێك هەریەك لە مامۆستاو فێرخواز بە هاوکاری بەڕێوەبەرو لێپرسراوانی فێرخوازان هەڵدەستن بە دانانی چەند ئامانجێکی شارەزاییبوون کە تایبەتن بەو ئەرك و

کارانەی فێرخوازان پێی هەڵدەستن. ئەم ئامانجە تایبەتانەش چەند هەوڵێکن بۆ نزیکبوونەوە لە ئامانجی سەرەکی، وە ناتوانن ببنە جێگرەوەی دوا مەسەلە.

**جۆن دیوی، چەند پێوەرێکی بۆ ئامانجەکان پێشنیار کردووە کە ئەمانەن:-**

- دەبێت ئامانجی پەروەردەییانە بەپێی پێداویستی و چالاکییە دەروونیەکانی فێرخواز دابڕێژرێت.
- گۆڕینی ئامانجەکانی بۆ کۆمەڵە شارەزایی و لێزانییەک ببنە فاکتەری بەهێزکەر بۆ چالاکی و ئاوەڵاکردنی تواناکانی فێرخواز.
- گرێدانەوەی ئامانجەکان بەو ژینگە تەندروستەی کە تواناکانی فێرخواز ئازاد دەکەن.

دەبینین لێرەدا ئامانجە پەروەردەییەکان باس لە سروشتی مرۆڤ دەکەن بەو جۆرە نا کە مرۆڤ چاکەخوازە، یا خراپەکارە، بەڵکو چۆنیەتی و چەندێتی ئەم خەسڵەتانە دیاریکەری ئەوەن کە مرۆڤ بە چیدا دەگوزەرێت کاتێک شارەزایی و لێزانی و لێهاتوویی و ئەزموونەکان لە خۆیدا دەبینێتەوە، هەر ئەمەشە وا لە مرۆڤ دەکات کە هێنەرەدی خودی خۆی بێت و هەوڵی چاکسازی و بەرەوپێشبردنی کۆمەڵگەش برەخسێنێت.

## ٣-بابەتەکانی خوێندن ( پرۆگرام ) لە فەلسەفەی پراگماتیزمدا:-

ڕێبازی پراگماتیزم بە پرۆگرام و شێوازە باوەکانی ئێستای بابەتەکانی خوێندن قایل نیەو وای دەبینێت دابەشبوونی پرۆگرام بۆ چەند بابەتێکی جوداو لێکدابڕاو، هەروەها ئەو ڕێکخستن و ڕیزبەندییە لۆژیکیەی ئێستا هەیە کارێکی نازانستی و نەشیاوە، چونکە ئەمانە لەگەڵ توانا و ئامادەیی و پێکهاتەی ژیری (منداڵ) فێرخواز گونجاوو لەبار نیە، هەروەها بە کارێکی دژوارو سەختی دەزانێت کە بابەتەکانی خوێندن بەشێکیان تایبەت و تەرخان بکرێت بە لایەنی مرۆڤانەو هەندێکی کەش بە لایەنی سروشتی ﴿واتە دابەشبوونی زانیاری و زانین بەسەر زانستە مرۆییەکان (مێژوو، جوگرافیا،...) و زانستە سروشتیەکان (کیمیا، فیزیا،...)﴾.

ئەو پرۆگرامی خوێندنەی فەلسەفەی پراگماتیزم بە باشی دەزانێت و لەگەڵ دیدو بۆچوونی ئەم ڕێبازە فکریەدا یەك دەگرێتەوە دەبێت سەرەتا لەسەر بنەمای یەکێتی و تەواوکاری زانیاری دامەزرا بن، پاشان دەبێت پرۆگرام لەسەر چالاکی و شارەزاییەکانی (منداڵ) فێرخواز وەك ئەوەی کە هەیەتی سەبارەت بە واقع دابڕێژرێت، چونکە هەر لەڕێی شارەزایی و لێزانینەوە زانیاریەکان بەدەست دێنێت، بە ئەزموونیش ڕاستی و دروستی ئەو زانیاریانە دێنە دی، هەروەها سودەکانیشی بەرجەستە دەبن.

کەواتە زانیاری دەبێتە یەکەیەکی چالاک لە خوێندنگاداو لێکۆڵینەوەش لەو زانیاریانە خۆی لە خۆیدا چارەسەرە بۆ کێشە زیندووەکان. هەر لەبەر ئەم هۆیەیە دەبێت هیچ جیاکاریەك لـەنێوان زانستە مرۆیـەکان و زانستە سروشتیەکاندا نەکرێت، یاخود لە نێوان زانیاری تیۆری و زانیاریە پراکتیکیەکان.

ئەم یەکێتی زانیاریە کـە ڕێبـازی پراگمـاتیزم بانگەشـەی بـۆ دەکـات وا دەسەپێنێت پرۆگرام (بابەتەکانی خوێندن) لەسەر یاخود بەپێی چالاکی فێرخـواز دابڕێژرێت، ئەمەش بەو مانایە نیە کە پێشتر پرۆگرام، یان چەند کتێبێکی بڕیار لەسەردراو ئامادە کرابێت و لەرێی دەسەڵاتەوە بەسەر فێرخوازاندا بسەپێنرێت و بەدرێژای چەندەها ساڵ لە خوێندنگاکاندا بخوێندرێن، بەڵکو دەبێت بوار بدرێتـە گەشەی فێرخوازان دۆزینەوەی توانا شاراوەکانیان، وەتا نەوپەڕی توانا بەرەوپێش ببرێن تا کۆمەڵگەیەکی زیندوو و هەمیشە لە گۆڕاندا بێتەدی.

هەربۆیە (جۆن دیوی) پێشنیار دەکات پێکهاتەکانی ئەو پرۆگرامـەی کـە پشت بە چالاکی دەبەستن لە قۆناغـەکانی خوێنـدن، ئـەو پیـشە باوانـەی نێـو کۆمەڵگـە لـەخۆ بگـرن، هـەروەها بابەتـەکانی خوێنـدن بـەو جـۆرە بـن کـە یارمەتیدەری تێگەشتن بن لە ژیانی کۆمەڵایەتی، بەو جۆرە دابڕێـژرێن فێرخـواز لەتوانایدا بێت پەیوەندی لێکۆڵینەوەی ئاقڵئامێز بەجێبهێنێ.

سەرەڕای بوونی کۆمەڵە هاوسەنگیەك بۆ یارمەتیدانی هەڵبژاردن و ڕێکخستنی بابەتەکانی خوێندن. بەو هۆیەی پەروەردە دادەنرێت بە ژیان، ئەوا بۆ بەجێهێنانی ئەم پرۆسەیە کۆمەڵێك مەرج دەسەپێنرێت وەك:-

- ڕەخساندنی ژینگەیەك بە واقعی و زیندوویی بناسرێتەوە بۆئەوەی کارلێك و ئاوێتەبوونێك لەگەڵ فێرخوازدا فەراهەم بکات.
- دەبێت فێرخواز کارو شارەزایی بە ڕێگەی ڕاست و دروستی فێربوون و زانین دابنێت.
- پێوەری بەرەوپێشچوونی فێرخواز بڕی توانایەتی لە نواندنی کارو چالاکیدا، هەروەها ئەو ڕەفتارانەیە پشت بە زیرەکی و چاوکراوەیی دەبەستێت.

## ٤-شێوازی وانەوتنەوە لە فەلسەفەی پڕاگماتیزمدا :-

لەم ڕێبازە فکریەدا بایەخ و گرنگیەکی تایبەت دەدرێت بە شێوازی وانەوتنەوە، چونکە دادەنرێت بە کلیلی پەروەردەیەکی تەندروست. بەجۆرێك جۆن دیوی وای بۆ دەچێت پەروەردەی ڕاست و دروست لەڕێی شارەزایی و لێزانی باشەوە دێتەدی دەبێتە یارمەتیدەری تاکە کەس لە بنیاتنانی زانیاریەکان و نوێکردنەوەو بەردەوامبوونیان. ئەو کاتەی فێرخوازێك چالاکیەك بە ئازادی ئەنجام دەدات، ئەوا بەپێی حەزو ئارەزوو و پاڵنەرەکانی دەجوڵێتەوە، ئەوەش دەبێتە شێوازێکی ڕاست بۆ یارمەتیدانی ئەو فێرخوازە تا ئامادەیی و تواناکانی خۆی

بزوێنێت، هەروەها ڕاهێنانیەتی لەسەر بیرکردنەوەی لۆژیکانەو سەربەخۆیی و

هاندانی بۆ ئەفراندن و داهێنان، هەر بەم شێوازەش درێژە بە پرۆسەی فێربوون

دەدات، ئەمەش شێوازی چارەسەری کێشەکانە، چونکە کارلێك و ئاوێتەبوونێك

لەنێوان فێرخوازو هەڵوێست و کێشەکاندا دروست دەبێت، بواری کارو چالاکی پێ

دەدات بۆ دۆزینەوەی چارەسەری گونجاو.

خوێندن و فێربوونی کاریگەر- چالاك و کارا، ئەوە نیە تەنها شارەزایی و

زانیاری بۆ فێرخواز فەراهەم بکات، بەڵکو سەرەڕای ئەم کارە دەبێت چالاکانەو

کاریگەر بەشداری بکات لە گۆڕین و بەرەوپێشچوونی کۆمەڵگاو بەردەوام بەرەو

باشتری بەرێت.

## ٥-ڕۆڵی مامۆستا لە فەلسەفەی پراگماتیزمدا:-

ڕۆڵی مامۆستا لە فەلسەفەی پراگماتیزمدا ئاڵۆزەو ئەرکێکی سەختی لەسەر

شانە، چونکە یەکەم: مامۆستا خاوەنی ئەزموون و شارەزاییەکانەو دووەم: هەر

دەبێت ئەمیش پلاندانەرو نەخشەدارێژی هەڵوێست و چالاکییە فێرکاریەکان بێت،

هەروەها ئەو مەرجە گونجاوو لەبارانە دادەنێت کە فێرکردن بەپێی هەڵوێستی

شارەزایانە دەخەنەڕوو. سێیەم ئەرکی مامۆستا: یارمەتیدانی فێرخوازە بۆ

دیاریکردنی گرفتەکەو کۆکردنەوەی زانیاری پەیوەیست بەو گرفتە بەهۆی

سەرچاوە جۆراوجۆرەکانەوە. چوارەم: ئەرکی مامۆستا ڕێزگرتنی ئازادی و هەستی

فێرخوازانەو بەئاگایی بوونە لە جیاوازییە تاکە کەسیەکانی نێوان فێرخوازان. ئەرکی پێنجەمیشی بریتییە لە: یارمەتیدانی فێرخوازان لە کاتی ڕووبەڕووبوونەوەی ئاستەنگەکان. شەشەم: کاری مامۆستا بەخشینی ئەو تواناییانەیە بە فێرخواز بەهۆیانەوە کارلێك و ئاوێتەبوونی تاکە کەسی و کۆمەڵی دروست دەکەن لەلایەکی دیکەوە دروستکردنی ئەم ئاوێتەبوونە لەگەڵ ژینگەکەیاندا، بۆ دەرخستن و دۆزینەوەی شارەزایی و لێزانی دروست، هەروەها لە پێکهێنانی خووڕەوشتی دروست و بەدەستهێنانی ئەزموونی بەسود، هەموو ئەم ئەرکانەش لە کەش و هەوایەکی دیموکراسیانەی ئازاددا بەجێ دەهێنرێن.

مامۆستا لەتوانایدا نابێت بەم ڕۆڵە گرنگ و پڕبایەخانە هەستێت گەر لێبوردەو بەپەرۆش و هاوڕێی و ڕێنمایکەری فێرخوازان نەبێت، سەرەڕای داهێنەری و فراوانی ئاسۆی بیرکردنەوەکانی و هاریکاری لەگەڵ فێرخوازو هاوکارەکانی، هەروەها گەر هەستی کۆمەلآیەتی و ڕامیاریانەی لەو جۆرە نەبێت کە خزمەت بە کۆمەڵگەکەی بکات ئەوا ناتوانێت ئەم ئەرکە هەستیارو گرنگە بەجێ بهێنێت.

## چوارەم: فەلسەفەی پەروەردەیی ئیسلامی:-

ئاینی ئیسلام سەبارەت بە: گەردوون، مرۆڤ، زانین، بەهاکان ڕامانێکی سەرتاسەری پێشکەش کردووە، تارادەیەك ئەم خوێندنەوەو تێڕامانە بە بەراورد لەگەڵ ئایینەکانی دیکەدا تێپەڕاندنێکە جا ئەو ئاینانەی دیکە چ ئاسمانی بن، یاخود زەمینی (واتە دانراو لەلایەن مرۆڤەوە)، ئەمەش لە شیکردنەوەی جیهان و سروشتی شتەکان و هەڵوێست و ڕووداوەکاندا خراونەتە ڕوو، بەپێی میانڕەوییەك لە بەڕێوەبردنی ژیانی دنیایی، یاخود دواییدا ئاشکرا دەبێت.

ئاینی ئیسلام بەو پێیەی میتۆدێکی سەرتاسەری هەموو ژیانی مرۆڤایەتیە، ئەوا هەوڵ دەدات ئەو بەختەوەرییە مرۆییە فەراهەم بکات کە خواوەند لە ئێستاو ڕۆژی دواییدا دایڕشتووە، بەڵام ئاینی ئیسلام تیۆرێکی پەروەردەییانەی سەبارەت بە ستراکچەری سیستمی پەروەردەیی و ئامانج و شێوازەکانی نەخستۆتە ڕوو کە بکرێنە بەرنامەو ستراتیژیەتی پەروەردەو نەوەی نوێی لەسەر گۆش بکرێت، بەڵکو ئیسلام چوارچێوەیەکی گشتی سروشتی ئایینی ئیسلامی خستۆتە ڕوو بەهۆیانەوە هەموو کۆمەڵگە بە ڕووە کۆمەڵایەتی و ئابووری و ئاکارییەوە لەخۆ دەگرێت، سەرداری شێوازەکانی مامەڵەکردن. ئەم بۆچوونانەش لە بونیاد و پێکهاتەو شێوازو ڕووخسارەکانیدا گۆڕانکاری بەسەردا

دێت بەپێی کات، یاخود کۆمەڵگەیەکەوە بۆ یەکێکی دی ئەم بۆچوونانەش سەرتاسەری پێکهاتووە، ئامانجەکانی لە ئایینی ئیسلامەوە سەرچاوە دەگرن.

سیستمی پەروەردەش وەك هەر پێکهاتەیەکی تری نێو بونیادی ئیسلام، بناغەو ئامانجی خۆی لە دیدی ئیسلامەوە هەڵدەقوڵێت و سەرچاوەکەی قورئان و سوننەتی پێغەمبەرە کە ئەم دوو سەرچاوەیە هەموو چالاکییە مرۆییەکان دەگرنەوەو پەیوەندیەکانی نێوان خودی تاکەکان و کۆمەڵگاکەیان لەخۆ دەگرێت، سەرەڕای ئامانجە باڵاکانی ڕەوشت بۆ دروستبوونی مرۆڤ و کۆمەڵگە.

پەروەردە بەگوێرەی ئەو مێژووە دوورودرێژەی ئیسلام هەیەتی چەندین پراکتیزەکردنی ئیسلامیانەی بەخۆیەوە دیوە...، هەروەها بڕێکی زۆر لە دیدو ڕای بیریارانی ئیسلام و زانایان و پەروەردەکارانی سەر بەم ڕێبازەی بەسەردا جێبەجێ کراوە بەو مەبەستەی جۆرێك لە پەروەردە بهێنرێتە کایە ناوەڕۆك و ئامانجەکەی بەپێی خواست و پێداویستی کۆمەڵگە بێت، هەر لەبەر ئەم هۆیە لێکنەچوون و جیاوازی هەیە لەنێوان تیۆری پەروەردەیی لە ئیسلام لەگەڵ تیۆری ئیسلامی لە پەروەردەدا.

یەکەمیان واتە تیۆری پەروەردەییانە لە ئیسلامدا:- مانای ڕووخساری پەروەردەییانە دەگەیەنێت لای چەند بیریارێکی ئیسلامی، بەواتایەکی تر تەوەرەکانی بونیادی هزری پەروەردەییانەیە کە لە ئیسلامەوە وەرگیراون و دارێژراونەتەوە، بەڵام ئاوێتە و تێکەڵ کراون بە کاریگەرێتی شارستانی و

فەلسەفەکانی دیکە. ئەو ڕێبازو قوتابخانە پەروەردەییانەی نێو فکری ئیسلامی هەن وەك:- ڕێبازی فەلسەفی پارێزگاران (المحافظین)، ڕێبازی فەلسەفەی قوتابخانە نەقلیەکانی نێو ئایینی ئیسلام کە تێکەڵی و ئاوێتەبوونی نێوان دانایی و شەریعەت دروست کردووە، ڕێبازی قوتابخانەی سۆفیگەرێتی کە سەراپا لە جیهانی ڕۆحیدا نوقم ببوون، هەروەها ڕێبازی قوتابخانە زانستیەکانی نێو ئیسلام کە گرنگیان بە کێشەکانی ژیان و پێداویستیەکانی ئەم ژیانە دەدا.

لە هەریەك لەم قوتابخانەوە ڕێبازە جۆراوجۆرەدا چەندین زاناو بیریاری ڕێچکەی ئیسلامیانە هەبوون نوێنەرایەتی و ڕەنگدانەوەیەك بوون بۆ پرۆسەی پەروەردەیی لە ئیسلامدا، لەم بارەیەوە نووسەری عەرەب (احمد الاهوانی) دەڵێت: "من وای دەبینمەوە عەرەب بەهیچ جۆرێك خاوەنی ئەو کۆمەڵە بابەتە پەروەردەییانە نەبووە کە بکرێنە سەرتاسەرو گشتگیر لە بواری پەروەردەدا، بەڵام ڕاستر وایە ناوی دامەزرێنەری ڕێبازێك بهێنرێت لەپاشاندا باس لەو بابەتەی فێرکردن بکرێت کە گونجاوو لەبار بووە لەو ڕێبازە ئایینیەدا".

دووەم تیۆری ئیسلامیانە لە پەروەردەدا:- ئەمیان ئاماژە بە سەرچاوەکان دەکات وەك قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەر، کە ئەم جمکە پێکهاتەی ئەو چوارچێوە گشتییەن هزری سەرتاسەری سەراپای ژیان لەخۆ دەگرن و سنووری کات و شوێن دەبەزێنن و بۆ هەموو تاکێك و کۆمەڵگایەك گونجاوو شیاو دەبن.

بەو جۆرە سەیری هەر شێوازێکی پەروەردەییانە لە ئیسلامدا دەکرێت:

هزرێکە بۆ پراکتیزەکردن و ئاڕاستەکردنی کارو ڕەفتارەکان، ئەمانەش هەموو لە سنوری هەوڵەکانی (الاجتهادات) زانایانی ئیسلام تێپەڕ ناکەن، ئەم هەوڵانەش وەك ئاشکرایە لە سنوری لێکدانەوەو ڕاڤەکردن و تێگەشتنی توانای مرۆییدا تێپەڕ نابن.

کۆمەڵە بنەمایەکی گشتی هەن لە ئیسلامدا سەرچاوەکەیان قورئان و سوننەتە، دادەنرێن بە ئاڕاستەکەرو بزوێنەری سیستمی پەروەردەو فێرکردن لە کۆمەڵگە ئیسلامییەکاندا دەتوانرێت بەم خاڵانە کورت و چڕبکرێنەوە :-

١- گەردوون سەرتاسەری لە خزمەت یەکتاپەرستیدایە.

٢- ئایینی ئیسلام پەیامێکی جیهانیە.

٣- لەدایکبوونی مرۆڤ خۆڕسکانەیە.

٤- هاوسەنگی و میانڕەوی.

٥- تەواوکاری و هاو بەرپرسیاری.

٦- کارو بەرهەمهێنان.

٧- جیاوازیەکان و یەکسانی.

٨- دادپەروەری و ڕاوێژکاری.

بەپێی ئەو پیشاندەرو ئاڕاستەکەرانەی پێشتر بە خاڵ خرانە ڕوو، پەروەردەی ئیسلامی شوێنکەوتەو جێبەجێکەری چەند بنەرەتێکی

فەلسەفیانەی ئیسلامیە، لە کاتی پراکتیزەکردنی ئەو تیۆرە ئیسلامیانەی کە باڵادەستن لە کایەی پەروەردەدا، ئەم لایەنانە دەگرنەوە:-

١- سرشتی مرۆیی.

٢- کاریگەریی و کارلێکی ژینگە لەگەڵ بۆماوەییدا (الوراثة).

٣- چاکەو خراپە.

٤- لێپرسراوێتی تاکە کەس...

## زانین لە پەروەردەی ئیسلامیدا

وەك لە قورئان و سوننەتەکانی پێغەمبەردا هاتووە مەبەست لە (المعرفە) زانستە، چونکە ئەو کاتانەی خودا وەسفی زاتی خۆی دەکات زانا نەك عارف بەکار دەبات زانستیش لە مەعریفە فراوانترە، وەك لە قورئاندا هاتووە خواوەند خاوەنی ئەم خەسڵەتانەیە (یعلم، علیم، علام، العالمین...) ئەمانەش هەمووی لە چاوگی (علم - زانست)ەوە وەرگیراون، زانست و زانیاریش بەپێی ئایینی ئیسلام دوو سەرچاوەیان هەیە:-

یەکەم سەرچاوەی خودایی (المصدر الالهي). دووەم سەرچاوەی مرۆیی (المصدر البشري) سەرچاوەی خودایی: بریتیە لەو زانست و زانیاریەی خواوەند دەیبەخشێتە کەسێکی دیاریکراو هەڵبژێردراوێك لە بەندەکانی خۆی، بەشێوەی

سروش (الوحي) یاساو ئەرك و فەرمانەکانی خۆی بەم کەسە دەگەیەنێت تا ئەویش بە خەڵکانی دیکە ڕابگەیەنێت.

ئەم سەرچاوەیش لە قورئان و سوننەتدا هەیە دەبێت مرۆڤی باوەڕداری ڕاستەقینە بڕوای تەواوی پێی هەبێت، چونکە دەبێتە سەرچاوەی تەشریع و فەرمان و ڕێگەی ڕاست و دروست، بۆیە دەبێت مرۆڤی موسڵمان گوێڕایەڵ بێ و کاری پێبکات.

سەرچاوەی دووەم مرۆییەو ئەو زانست و زانیاریانە دەگرێتەوە مرۆڤ لەڕێی ژیرییەوە پێیان دەگات، هەروەها لەڕێی هەستەکانەوە درکیان پێدەکات. مرۆڤیش ئەم زانست و زانیاریانە بەجۆرە بەدەست دێنێت: کاتێك شێوازەکانی لاسایی و چاولێکەری و تێبینی و ئەزموون و پێزانین سەبارەت بە دەوروبەر بەکاردەهێنێت.

جگە لەم دوو سەرچاوەیەی باسکران سەرچاوەیەکی دیکەش لە ئیسلامدا بۆ بەدەستهێنانی زانست و زانیاری هەیە ئەویش (الاجتهاد)ە، واتا ئەو هەوڵدان و لێکدانەوەو شیکردنەوەو بەئەنجامگەشتنەی زاناو بیریارانی ئیسلام سەبارەت بە مەسەلەیەك لە مەسەلەکان، ئیجتیهاد دادەنرێت بەجۆرێك لە زانیاریەکانی ژیری، ئەمەش بەڵگەیە لەسەر پێشکەوتوویی و گونجاندنی مەسەلە ئاینیەکان لەپێناو ئەم دنیاو گەشتنە بەچارەسەری لەبارو گونجاو.

## ١-ئامانجە پەروەردەییەکانی فەلسەفەی پەروەردەیی ئیسلامی

بەپێی ئاراستە گشتیەکانی پەروەردەو بنەما سەرەکییەکانی پەروەردەی ئیسلامی کە پێشتر باسکران دەکرێت ببنە چوارچێوەیەکی گشتی بۆ میتۆدێکی تەواوی پەروەردەییانەو ئاراستەکەری فکرین و بالادەستی کاری پەروەردەییانە بکەن، بەمەش ئامانجی پەروەردەی ئیسلامی لەوەدا بەرجەستە دەبێت مرۆڤی موسڵمان ئامادە بکات بەو جۆرەی هەموو لایەنەکانی ژیانی بگرێتەوە بۆئەوەی کەسێکی لێ دەربچێت کە خاوەنی هەردوو دنیا بێت (ژیان و قیامەت)، بەو مانایە ئامانجی هەرە باڵای پەروەردەی ئیسلامی گەشتنە بەپلەی کەماڵ واتا تەواو بێ خەوش و کەم و کوڕی مرۆیانەیە، لە دەرەنجامدا ئەم ئامانجانە بەرجەستە دەبن: ئایینی، ئەقڵانی، کۆمەڵایەتی، دەروونی. ئێستا بەکورتی ئاماژەیەك بە هەر لایەنێك لەمانە دەدەین:-

+ باوەڕهێنان بە خوداو پەرستنی:-

ئەمەش باوەڕداری و یەکتاپەرستی دەگەیەنێت، باوەڕهێنان بە فریشتەکان، بە ڕۆژی زیندووبوونەوە، بە قەزاو قەدەر، بە چاك و خراپیەوە... ئەمەیان لایەنی ئایینی.

+ ڕەوشت جوانی و زاڵبوون بەسەر هەڵسوکەوت و ڕەفتارەکاندا:-

پەروەردەیی ڕەوشتی (ئاکاری) بریتیە لە ڕۆحی پەروەردەیی ئیسلامی و ئامانجی هەرە باڵای ئەم جۆرە پەروەردەیە، چونکە بەپێی ئایینی ئیسلام تەواوی

و بێ کەم و کوڕی، واتا بوونی ڕەوشتە بەرزو باڵاکانمان...، بۆیە دەخوازرێت کە پەروەردە ئامانجی پەروەردەکردنی دەروون و پاککردنەوەی ڕۆح و ئەقڵ و ویژدان بێت، ئەمەش مرۆڤ دەگەیەنێتە پلەی خاوەندارێتی ڕەوشتە باڵاکان.

+ بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوە:-

لێرەدا پەروەردە هانی فێرخواز دەدات توانای ژیریی پەرەپێبدات لەسەر بیرکردنەوەو ڕامانی قوڵ و ڕاست و دروست ڕابهێنێت سەبارەت بە بوونەوەرەکانی ژێر دەسەلاتی خواوەندو (بوون)، سەرەڕای بەڕێوەبردنی ژیانی ڕۆژانەو کێشەکانی کۆمەڵگا، ئەمانەش بەهۆی برەودان بە زانست و زانیارییە شەرعیەکان، یان ئەدەبیەکان، یاخود زانستە سروشتیەکان دەرەخسێن.

هەروەها ئەم جۆرە پەروەردەیە هانی مرۆڤ دەدات میتۆدی زانستی لە خوێندن و لێکۆڵینەوەکانیدا بەکاربهێنێت و لەسەر بەڵگەهێنانەوەو هەڵێنجاندن و زانیاری و بەدەستهێنانی زانست ڕابهێنێت، هەروەها هانی فێرخواز دەدات لەسەر شێوازی خۆفێرکردن (التعليم الذاتي)، وە بەردەوامبوون لە خوێندن و بیرکردنەوەو لێکۆڵینەوە لە هەموو کاتەکانداو بەجۆرێکی هەمیشەیی.

+ برەودان بە گشت لایەنەکانی کەسایەتی مرۆڤ:-

ئامانجی پەروەردەیی ئیسلامی پەرەدانە بە توانای ژیریی و جەستەیی و دەروونی مرۆڤەکان بێ زاڵکردنی لایەنێك لەمانە بەسەر لایەنێکی دیکەدا،

بۆئەوەی مرۆڤ لەتوانایدا بێت سەراپای ئەرکە کۆمەڵایەتی و سروشتیەکان جێبەجێ بکات بەجۆرێکی هاوسەنگ و میانڕەوانە.

+ ئاگاداربوون لە حەزو ئارەزووەکانی تاکە کەس و پێداویستی گەشەسەندنی:-

بێ ناچارکردن و زۆرەملێ، چونکە هەر ئەفرێنراوێکی دەستی خواوەند بەرەو ئەو شتە دەچێت کە لەپێناویدا خوڵقێنراوە. لە پەروەردەی ئیسلامیدا بوار دەدرێتە تاکە کەس فێر بێت و گەشە بسەنێت تا ئەو پلەو قۆناغەی خۆی دەیخوازێت و لەتوانایدایە.

+ گەیاندنی زانست و ئەزموونی بەسود تا لێهاتوویی لەکاردا بڕەخسێت:-

هەرچەندە زۆربەی ڕێچکە فیکرییەکانی نێو کۆمەڵگەی ئیسلامی بەهای کارکردنیان پشتگوێ خستووە، بەڵام لە ڕاستیدا ئیسلام پلەوپایەیەکی تایبەتی بۆ کارکردن داناوە، بۆیە دەبێت پەروەردەی ئیسلامیانە زانست و کارکردن پێکەوە گرێبدات تا کەسانێك پەروەردە بن ئەرکەکانی خۆیان بزانن و مرۆڤگەلێکی بەرهەمهێنی کۆمەڵگە بن.

+ برەودان بە بەهاگەلێکی ئاکاریانە (ڕەوشتیانە):-

ئەویش بە ڕەخساندنی ژینگەیەکی تەندروست برەو بە لایەنی چاکەخوازی لای مرۆڤ بدات پەروەردەکەری ویژدانی تاکەکان بێت، مەبەستیش لەو بەهایانە:- ڕێزگرتن و قەدرزانی لە کار چ کارێکی ژیریی، یا جەستەیی، وە یا

سۆزداریی بێت، هەروەها بەهای گوێڕایەڵی و ملکەچی، بەهای ڕێزگرتن لە دەسەڵات، بەهای بەتەنگەوە هاتنی کات و بەڵێننامەکان، سەرەڕای چاندنی بەهای ڕاستگۆیی و دەستپاکی و دادپەروەری و لەخواترسی و..... هتد.

**+ ڕێزگرتن لە ڕای جیاواز:-**

ئامانجی پەروەردەی ئیسلامی ئاڕاستەکردنی تاك و دەزگا ئایینیەکانە بۆ ڕێزگرتنی کەسانی دیکەی سەر بە ئایینەکانی ترو باوەڕێکی ئایینی جیاوازیان هەیە، جەخت لەسەر پارێزگاریکردن و بواردانیان بە جێبەجێکردنی ڕێ و ڕەسمی ئایینی خۆیان بێ هیچ دەستتێوەردان و دەمارگیری کوێرانە، هەروەها لێبوردەییان بەرامبەر بنوێنرێت و ڕێگە لە دابونەریت و خووەکانیان نەگیرێت (لاإکراه في الدين). البقره- ٢٥٦. ئەگەر ئەمانە بە دروستی جێبەجێ بکرێن، ئەوا دەرەنجامەکەی دەرخستنی لێهاتوویی و توانا باڵاکانی ئیسلام و بەهای لێبوردەیی و بەرجەستەکردنی بانگەشەی ئەم ئایینە دەردەخەن بۆ چاکەو ڕاستی و ئاشتی، سەلمێنەری ئەو ڕاستیە دەبێت کە ئیسلام بانگەوازێکی جیهانیەو ئاڕاستەی سەراپای مرۆڤایەتی کراوە.

## پرۆگرام (بابەتەکانی خوێندن) لە فەلسەفەی پەروەردەیی ئیسلامیدا

بەو هۆیەی پەروەردەی ئیسلامی ئامانجی پێگەیاندنی مرۆڤگەلێکی موسڵمانی باوەڕداره، زانیاری هەبێت سەبارەت بەخواوەند، ئەویش بە شارەزایی و زانینی مەسەلە ئایینیەکان، بۆیە دەبینین زانستە ئایینیەکان گرنگترین پێکهێنەرەکانی پرۆگرامی خوێندنن لەم فەلسەفەیەدا. زانستەکانیش وەك:- قورئان، فەرموودەکان، تەفسیر، فقەو سیرەو یەکتاپەرستی، مێژوو و ڕێ و ڕەسمەکانی خواپەرستی. بەو هۆیەی ئەم زانستانە بناغەو بنەڕەتی ڕۆشنبیرکردنی ژیرین و دەروونپاك دەکەنەوە، سەرەڕای ڕێزو پلەی بەرزی نێو کۆمەڵگەش بەدەست دێنێت... هەر لەبەر ئەم هۆیانە بوو ئەم زانستانە بەدرێژایی شارستانیەتی ئیسلامی تەنانەت لە کاتەکانی نوشوست و سستی و چەقبەستنیشدا تەوەری سەرەکی پەروەردەو فێرکردن بوون. تەنانەت لەم سەردەمەشدا هەر بە بابەتی سەرەکی دادەنرێت، بەڵام لەپاڵ بابەتگەلێکی دیکەی وەك سروشتناسی و کۆمەڵایەتی و ئەزموونی و پراکتیکیەکان، چونکی ئاینی ئیسلام وای بۆ دەچێت کە دەبێت مرۆڤی موسڵمان تێگەیشتن و لێکدانەوەی بۆ دنیای خۆی هەبێت و بیکاتە هۆکارێك بۆ وەدەستهێنانی ئەو دنیا (قیامەت).

**پرۆگرامەکانی خوێندن لە پەروەردەی ئیسلامیدا ئەم بابەتانە لەخۆدەگرن:**

یەکەم:- زانستە ئایینیەکان (پێشتر ئاماژەیان پێ دراو باس کراون).

دووەم:- زانستە دنیاییەکان، ئەمانیش ئەو بابەتانە لەخۆ دەگرن کە دەبنە هۆی گەشەو پەرەسەندنی ژیریی و جەستەیی و ویژدانی، سەرەڕای شارەزایی و ئەزموون و ئاڕاستەی بیرکردنەوە، کەواتە هەموو زانستە نوێکانی مرۆڤایەتی هاتوونەتە نێو پەروەردەی ئیسلامیانەو بوونەتە بەڵگەو جەختکردنەوە لەسەر گشتگیری و سەرتاسەربوونی ڕێبازی ئیسلام.

## شێوازی وانەوتنەوە لە پەروەردەی ئیسلامیدا

بە کردار دەرکەوتووە ئەو بایەخەی پەروەردەی ئیسلامی بە ژیریی داوە، وا دەخوازێت کە شێوازی وانەوتنەوە پشت دەبەستێت بە (الالقاء)، (التلقین) لەلایەن مامۆستاو فێرکارەوە، فێرخوازیش لەم شێوازەدا لەبەرکردن و دووبارە دانەوەی زانیاریەکان و وتنەوە یانە، جگە لە چەند شێوازێکی دیکەش بەپێی گونجاویان لەگەڵ بابەتەکان و هەڵوێستەکاندا وەك شێوازی پێشەنگ و ڕابەری نموونەیی (القدوة الصالحة)، هەروەها شێوازی خۆشەویستکردنی بابەت و شێوازی ترساندن و شێوازی ئامۆژگاریکردن و ڕێنیشاندان و پاداشت و سزادان. هەتا ئێستاش لەم سەردەمەدا ئەم شێوازانە لە خوێندنە ئاینیەکاندا پیادە دەکرێن، بەڵام چەند شێوازێکی نوێ و سەردەمیانەی خراوەتە سەر.

سەبارەت بەپلە و پایەی مامۆستاش، ئەوا لەو ئەرکەیەوە دیاری دەکرێت کە پەروەردەکردنی منداڵ و یارمەتیدانی نەوەکان بۆ گەشەکردنێکی گشتگیرو تەواو، هەروەها بەو پێیەی کە مامۆستا نەوەکان لەسەر ڕەوشتی جوان و باڵا پێدەگەیەنێت، بەڵام لە سەدەکانی چەقبەستن و سستی شارستانی ئیسلامیدا بەهای مامۆستاو پلەوپایەی بەرەو داشکان و ڕۆچوون دەهات، چونکە بەهۆی کۆمەڵێك فاکتەری بابەتیانەو خودی بارودۆخەکەوە ڕۆڵی مامۆستا گۆڕانکاری بەسەردا هات، وەك لەوەی بووە گەیەنەرێکی زانیاری لەبەرامبەر کرێیەکی دیاریکراودا، سەرەڕای بێ بەهرەیی و کەم توانایی مامۆستا لە ئەرکەکانیدا.

## پێنجەم:- فەلسەفەی سروشتگەرایی:-

## پەروەردەی فەلسەفەی سروشتگەرایی

دامەزراندنی بزوتنەوەی سروشتگەرایی لە بواری پەروەردەدا دەگەڕێتەوە بۆ بیرمەندی فەرەنسی (جان جاك ڕۆسۆ ١٧١٢ -١٧٧٨)، وەك ئاشکرایە ڕۆسۆ فەیلەسوف نەبووەو بیری پەروەردەییانەش لای ئەم مۆرکێکی فەلسەفیانەی پەتی وەرنەگرتبوو بەو جۆرەی لە ڕێبازە فەلسەفیەکانی پێشوتر باسکران، وەك فەلسەفەکانی دیکە لایەنی تیۆری و پراکتیکی نەبووە، بەڵکو ئەم بیرمەندە زیاتر بە چاکسازێکی کۆمەڵایەتی دەچوو (مصلح إجتماعي)، ئەویش بەهۆی ئەو

نەهامەتی و جۆرو ستەم و کۆت و بەندە کۆمەڵایەتیەی بەسەر ئەم و مرۆڤی سەردەمەکەیدا سەپێنرابوو.

بۆچوونی ئەم بیرمەندە سەبارەت بە چاکسازی باری مرۆڤ بە دۆزینەوەی شێوازی پەروەردەیانەی نوێ فەراهەم دەبێت، ئەم بۆچوونەی لە پەرتوکە پەروەردەییەکەیدا خستبوە ڕوو بەناوی (ئیمیل و چاکسازی باری کۆمەڵگا) ئەم کتێبەش نووسەر کردبوویە بەشێك لە پەرتووکە بەناوبانگەکەی (پەیمانی کۆمەڵایەتی).

هزری پەروەردەییانەی ئەم بیرمەندە وەك پەرچەکردارێك، یان کاردانەوەیەکی ڕاستەوخۆی هزرە پەروەردەییە باوەکانی پێش خۆی بووە، بەڵام پێشنیارە پەروەردەییەکانی ئەم بیرمەندە ڕەنگ و ڕووخسارێکی چاکسازی کۆمەڵایەتیان هەبوو، دوور بوون لە ڕەسەنایەتی و ڕیشەیی فەلسەفیانە، هەروەها پشت بەستوو نەبوون بە کاری ئەزموونی، لەگەڵ ئەوەشدا ڕاو بۆچوونەکانی ڕۆسۆ کاریگەرییەکی مەزنیان لەسەر پەروەردە، بەڵکو لەسەر پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونی بزوتنەوەی سروشتگەری هەبووە.

فەلسەفەی سروشتگەرایی پێچەوانەی فەلسەفەکانی دیکە وەدەرکەوت، چونکە ڕێبازە فەلسەفیەکانی پێش سروشتگەرایی زیادەڕەوییەکی ئاشکرایان سەبارەت بە پیرۆزکردنی ئەقڵ دەکرد، سەرەڕای بەهەندوەرنەگرتنی منداڵی و لایەنە ویژدانی و سۆزداریەکان، وە سەربەستی و مافەکانی مرۆڤیان پشتگوێ

دەخست، بە بۆچوونی ئەمان مرۆڤ خراپەخوازو شەڕانیە، پەروەردەش بۆ جڵەوو کۆنترۆڵکردنی ئەو خراپەکاریانەیە.

فەلسەفەی سروشتگەرایی لە بیرۆکەی (گەڕانەوە بۆ سروشت)ە وە دەستی پێکرد، چونکە سروشت باشترین شوێن و ژینگەیە مرۆڤ تێیدا بە ئازادی و سەربەخۆیی بژی. لە دیدی ئەماندا هەر شتێك سروشتی بێت، ئەوا هەڵگری خەسڵەتی پاکی و بێگەردییە، چونکە سروشت لەژێر ڕکێفی چەندین یاسای نەگۆڕو هاوسەنگیەکی ناوەکیدایە، لەڕێی دیاردە سروشتیەکانەوە هەمیشە دەتوانێت پارێزگاری لەخۆی بکات.

بەم پێیەش سروشتی مرۆڤایەتی شوێنکەوتەی یاسا سروشتیەکانە، چاکتر وایە وازی لێبهێنرێت بۆ سروشت و یاساکانی، بەرهەمی پەروەردەش بە بۆچوونی سروشتگەراکان دەبێت کەسانێك ئامادە بکات هەلی پەرەسەندنی سروشتی مرۆڤایەتی بڕەخسێنن بێ دەستێوەردان و زۆرەملێ و ناچارکردن لەلایەن کەسە گەورەو پێگەیشتووەکان. هەر کەموکوڕیەك لە پرۆسەی پەرەسەندنی مرۆڤەکاندا، یاخود بوونی هەر خراپەکاری و شێواندنێك لە کۆمەڵگادا، ئەوا دەگەڕێتەوە بۆ کۆمەڵگاو دەستێوەردانێکە بۆ یاسا سروشتییە خێرخوازیەکان.

ئەو خاڵانەی کە فەلسەفەی پەروەردیی سروشتگەراییان لەسەر بەندە دەتوانین بەم جۆرە چڕیان بکەینەوە:-

+ باوەڕهێنان بە سروشتی خێرخوازانەی مرۆڤایەتی ئازادو دەگمەن ڕێزی تەواو لە خودی تاکە کەس دەگرێت و ئەو مافەی پێ ڕەوا دەبینێت پەرە بە تواناکانی سروشتی چاکەخوازی دەدات، هەموو خواست و ئارەزووەکانی دێنێتە دی، ئەو سەربەستییەی داوەتی کە شتگەلێك هەڵبژێرێت لەگەڵ حەزو خواستەکانیدا بگونجێت، ئەمەش ئەو خاڵەیە زۆرێك لە پەروەردەکارانی وەك (فرۆبل و بستالۆزی و هربارت) جەختی لەسەر دەکەنەوەو دەڵێن:- چاکتر وایە بگرە بە پێویستیش دەزانرێت منداڵان وازیان لێبهێنرێت لە سروشتەوە فێربن و دووربن لە کۆمەڵگاوە، چونکە منداڵ توانایەکی سروشتی و خۆڕسکی تێدایە ئەو بوارەی دەداتێ خۆی تاقی بکاتەوە.

+ باوەڕبوونی ئەم فەلسەفەیە بە چاکەخوازی سروشت کە لەژێر ڕکێفی چەندین یاساو ڕێسای تا ئەوپەڕی وردو ڕێکخراودایە، هەر ئەم سروشتەش هەڵگری خەسڵەتەکانی تەواوکاری و هاوسەنگیە. لەم بارەوە (ڕۆسۆ) دەڵێت: "هەموو شتێك چاك و باشە تا ئەو ساتەی لە دەستی سروشتدایە، بەڵام کاتێك ئەم شتانە دەستی مرۆڤیان پێ بگات، ئەوا توشی گەندەڵی و خراپی دەبن."

+ گۆڕانی کۆمەڵ و بەدیهێنانی کۆمەڵگایەکی دادپەروەر مەسەلەیەکی پێویستە، چونکە مرۆڤ ناتوانێت ئازادو سەربەست بێت ئەگەر لە کۆمەڵگایەکدا نەبێت کە ڕێسای ئیرادەی گشتی ببێات بەڕێوە، تا جێگرەوەی ئیرادەی تاکە کەس بێت، چونکە لەو جۆرە کۆمەڵگایەدا خۆشەویستی و پێکەوە ژیان جێگەی

دوو بەرەکی و ناکۆکییەکان دەگرێتەوە، ئەم کارەش بەپێی پەیمانێکی کۆمەڵایەتیانەیە کە زامنکەری گرێبەستێکی ئازادانەیە لەنێوان خەڵکیدا.

+ بایەخدان بە (ئێستا)ی مرۆڤ و پەرەسەندنی لە بنەڕەتەوە، چونکی (ئێستا) خاڵی گرنگ و جێگەی بایەخی تاک یاخود منداڵە لە ژیانیدا، لەبەرئەوەی منداڵان هەموو بەیەك ئاستی توانایی و لێهاتوویی لەدایك نابن و هەموویان یەك جۆر نین، بۆیە پێویستە لە ئێستای خۆیان بژین و لێوەی فێر ببن. هەر منداڵێك ئەزموون و تاقیکردنەوە دەکات و بەو جۆرە دەربارەی خودی خۆی ڕا دەردەبڕێ کە لە بەرژەوەندی خۆیدا بێت، بەهۆی خۆگونجاندن و ڕاهاتن لەگەڵ پاڵنەرەکان (الدوافع) بەختەوەری هەنووکەیی و داهاتووش فەراهەم دەکات.

+ ئازادکردنی مرۆڤ لە کۆت و بەندی ڕابردوو، سەرەڕای ڕزگاربوون لە کۆیلەیەتی و جەورو ستەم و سەرکوتکردن.

## بنەما پەروەردەییەکانی فەلسەفەی سروشتگەرایی

دیلو بۆچوونی فەلسەفەی سروشتگەرایی لە بواری پەروەردەدا لەم خاڵانەی خوارەوە ڕەنگیان داوەتەوە:-

- کارکردن لەسەر پراکتیزەکردنی بنەمای پەروەردەیی نێگەتیڤ لە سەرەتای ژیانی منداڵدا، بەجۆرێك ڕێدەدات بە منداڵ ڕاستەوخۆ لە ئەزموونە

زیندووەکانەوە فێربێت تێکەڵ بە سروشت و پێکهاتەکانی ئەو سروشتە ئاشنا بێت و لەگەڵ (شت)ە کان و ڕووداوو هەڵوێستەکان کارلێك بکات، ئەمانەش لەڕێی یاریکردن یان بە چەند شێوازێکی دیکە دەڕەخسێن... بۆ نموونە:- هەر لە منداڵییەوە فێر دەبێت ئاگر سوتێنەرە، یاخود سەرما هۆکاری نەخۆشکەوتنە، کەواتە بەمجۆرە منداڵ بۆ خۆی گەشە دەکات و گرنگی بەو شتانە دەدات کە جێگەی سەرنج و بایەخی ئەم بن بێ دەستتێوەردان لەلایەن گەورەکانەوە.

ئەمەش بەو مانایە دێت ڕۆڵی دایك و باوك و مامۆستا تەنها ڕەخساندنی بارودۆخ و کەشی فێربوونە بێئەوەی دەرکەون، بەڵکو دەبێت تەنها لە پشتی پەردەوە بن پاش ئەوەی ئامادەسازیان بۆ ئەزموون و شارەزاییەکانی فێربوون کردووە.

- ئەم شێوازە پەروەردەییە پاڵنەر بووە بۆ گرنگیدان بە سایکۆلۆژیای گەشەسەندن، ئەم ڕێبازە فکریەش (سروشتگەرایی) یەکەمین فەلسەفەیە ئاماژەی بە گرنگی و بایەخی قۆناغەکانی گەشەسەندنی منداڵی کردبێت، چونکە قۆناغەکانی گەشەسەندن چەند تایبەتمەندیەکیان هەیە، هەر قۆناغەو پێداویستی تایبەتیان دەخوازن، وە دەبێت پەروەردەش شانبەشانی ئەم قۆناغە ڕێ بکات. ئەم بۆچوونەش لەگەڵ دیدو تێڕوانینی دەروونناسانی نوێدا تەبایە.

- ئەم ڕێبازە فەلسەفیە دەرخەری جیاوازیە تاکە کەسیەکانی منداڵە (الفروق الفردیة) وەك لە دیدی بیرمەندانی ئەم فەلسەفەیەدا جەختی لێکرابوو،

ئەمەش کۆك و تەبایە لەگەڵ بنەماکانی سروشتدا، چونکە منداڵان هەموو خاوەن یەك ئاست و توانا نین، بۆیە لەسەر پەروەردە پێویست دەبێت پرۆگرامەکانی خوێندن بەپێی تواناو خواست و حەزو ئارەزووەکانی منداڵ ڕێك بخات، بەم جۆرەش پەروەردەکردنی منداڵ دەبێت جیاوازتر بێت لەپەروەردەکردنی کەسێکی گەورەو پێگەشتوو.

- پەروەردەکارو پەیڕەوانی ئەم ڕێبازە فکریە بانگەشەی تێکەڵبوونی ڕەگەزی نێرو مێ دەکەن لە پرۆسەی خوێندندا، چونکە ئەم تێکەڵبوونە دەبێتە هۆی زیادبوونی گیانی هاوبەشی و کاری بەکۆمەڵ، وە لەگەڵ سروشتی مرۆڤانەو گەشەسەندنی تەندروستیشدا لەبارو گونجاوە، بەڵام سروشتگەراکان جەخت لەسەر ئاگابوون لە پێداویستیەکانی نێرو مێ دەکەنەوە، نەك تەنها لەو ڕووەی لەگەڵ سروشتی- ئەرکی نێر، یاخود مێ دەگونجێت، بەڵکو لەو ڕووەوەی کە لەگەڵ ئەرکە کۆمەڵایەتیەکانیشدا گونجاو بن.

- ڕەخساندنی سەربەستی تەواو بۆ فێرخواز تا بتوانێت دەربڕی ناخی خۆی بێت، ئەمەش بکرێتە ئامانجێکی بنەڕەتی بۆ گەشەسەندنی سروشتیانەی خود بەو جۆرەی خواوەندو سروشت ئەفراندویەتی. ئەمەش وا دێتە دی لە کاتی دانانی ئەو ڕێسایانەی هەڵسوکەوت و ڕەفتاری فێرخواز دیاری دەکات ئازادی و سەربەستی فێرخوازان ڕەچاو بکرێت، وە بەو جۆرە ببرێن بەڕێوە ویستی خۆیانی تێدا بێت. هەر بەم هۆیەوە پەیڕەوانی ڕێبازی سروشتگەرایی قایل نابن قوتابخانەو

خوێندنگاکان لەژێر دەسەڵاتی حکومەتدا بن، ئەوان وا بەچاک دەزانن ئەم شوێنی خوێندن و فێربوونە بدرێتە دەست ڕێکخراوو دەستەو دەزگا ناوخۆییەکان.

## شەشەم:- فەلسەفەی بوونگەرایی (بوونخوازی):-

شەپۆلێکی فەلسەفیانەیە بۆ بەرپەرچدانەوەی ڕێبازە فەلسەفیەکانی پێش خۆی سەریهەڵدا لە سەدەی بیستەمدا، هەموو مەسەلە فەلسەفیەکانی دەگەڕاندەوە بۆ (بوون - الوجود) لە هەمووشیان گرنگترو بالآتر مرۆڤ بوو، بەو مانایەی فەلسەفەی بوونگەرایی بوونی مرۆڤی بە یەکەمین کێشە فەلسەفیەکان دادەنا، دەبووا ئەم مەسەلەیەش تەوەری بیری فەلسەفیانە بێت، چونکە (بوون)ەکانی دیکە (الموجودات) بریتین لە ماناو هێمای زیندوو کە مرۆڤ تیایاندا دەژی. بەمجۆرەش هزری مرۆڤ تێگەشتنە لەم هێماو مانایانە لە سەرەتاو دواجاریشدا، کە ئەمەش بە درکپێکردنی تێگەشتنە لە بوونی مرۆڤانە (الوجود الانساني).

بەو پێیەی بوونگەراکان بۆی دەچوون (بوون) بریتیە لە ڕواڵەتی پاك و بێگەردی بوونی مرۆڤ. ئەر بڵێین مرۆڤ (بوونی) هەیە، ئەوا (ماهیەتی) دەبێت، ماهیەتیش دیاریکەری (بوون)ە لە دەرەنجامی ئەو کردەوانەی خۆی هەڵیان دەبژێرێت.

ئەم ڕێبازە فەلسەفیە وەك دەرەنجامێكی ئەو بارودۆخە گشتیە هاتە ئاراوە كە بەهۆی هەردوو جەنگی جیهانی كاریگەریەكی قووڵ و ڕیشەیی لەسەر مرۆڤەكان جێهێشتبوو. ئەو دەرەنجامەش وەك: ڕاڕایی و هەست بە ڕووخان و تێكشكان و مرۆڤیان گەیاندە ئەو باوەڕەی بوونی مرۆڤایەتی بوونێكی فشۆڵ و خۆنەگرە، هەر لەبەر ئەم هۆیانە هەموو ئەو لق و ڕێچكە فەلسەفیانەی سەر بە هزری بوونگەرایی بوون ڕوویانكردە ڕووتكردنەوەی (بوون)ی مرۆڤایەتی و پەردەهەڵماڵین لەڕووی ئەو كۆت و بەندو ڕێگرو دیاردە لاوازانەی ئازادی مرۆڤ داگیر دەكەن، سەرەڕای ئەمانە بانگەوازێك بوو بۆ پشوودانی ژیریی مرۆڤ لە بۆتەی هزرە چەقبەستوو و نەگۆڕەكان، وە بانگەشە بوو بۆ ڕزگاربوون لە بیرۆكە سادەو باوەكانی پێش خۆیان، خوازیاری ئەوەش بوون بوار بدرێتە ژیری مرۆڤ سەربەستانەو بێ هیچ كۆت و بەندێك بیربكاتەوە.

بەمجۆرە فەلسەفەی بوونگەرایی پاش جەنگی جیهانی دووەم ناوبانگی سەرتاسەری دنیای گرتەوە، چونكە ڕووبەڕووبوونەوەی ئەم ڕێبازە فكریە بەرامبەر بە كێشەو گرفتەكانی مرۆڤ هێماو ئاماژەیەكی واقعیانەی هەبووە.

بوونگەرایی وەك ڕێبازێكی فەلسەفی دەگەڕێتەوە بۆ (كیركەگارد ١٨١٣ — ١٨٥٥) فەیلەسوفی بەناوبانگی دانیماركی یەكەمین كەس بووە مانای بەخشیوەتە چەمكی (بوون) لەو كاتەی بیرۆكە فەلسەفیەكانی خۆی بە شێوازێكی

دراماتیکیانە خستبووەڕوو. ڕەخنەی لە هەموو ئەو گوتە زیایانەی دەگرت کە ئەقلانیەتێکی پەتی بوون.

پاشان ئاسۆکانی هزری فەلسەفەی بوونگەرایی لەسەر دەستی گەورە فەیلەسوفانی وەك (هایدگەر، غابریل مارسیل، کارل یاسیبرز، جان پۆل سارتەر) فراوانتر کران، ئەمانیش بە قوتابی (کیرکەگارد) دەژمێردران، وە کاریگەریەکی زۆریان هەبووە لەسەر بلاوبوونەوەی ئەم ڕێبازە فکریەو بالادەست بوونی.

## پێناسەی بوونگەرایی:-

پێدەچێت پێناسەکردنی بوونگەرایی سەخت و دژوار بێت، بەهۆی جیاوازی و لێکنەچوونی ڕاو بۆچوونەکانی خودی بوونگەراکان دەربارەی ئەو میتۆدو شێوازەی پێویستە لە فەلسەفەکەیدا ڕەچاو بکرێت کە دەربارەی بوونی مرۆیانە بێت. سەرەڕای ئەوەی فەیلەسوفانی ئەم ڕێبازە جەخت لەسەر ئەوە دەکەنەوە ڕێبازە فەلسەفیەکەیان بریتیە لە بەرەوبوومی ئەزموونێکی ژیانی، یاخود ئەزموونێکی تاکە کەسیە.

بەهەرحاڵ دەکرێت پێناسەیەك بۆ بوونگەرایی بکرێت لەڕێی شیکردنەوەی زاراوەی (Existentialism) کە لە دوو بڕگە پێکهاتووە یەکەمیان (Existence) واتا (بوون). ئاوەڵناوەکەی (Existential)ە، بڕگەی دووەمیش

(Lism) واته (پێش) بە ئاوێتەکردنی هەردوو بڕگەکە واتای (بوون پێش شتەکانی دیکە هەبووە).

کەواتە بوونگەرایی جەخت لەسەر ئەوە دەکاتەوە: (بوون - الوجود)ی مرۆڤ پێشتر هەبووەو کردەوەو ڕەفتارەکانی ئەم بوونە دیاریکەری پێکهاتەو بوونیەتی.

## بیرۆکە بنەڕەتیەکانی بوونگەرایی

هەموو فەیلەسوفەکانی ڕێبازی بوونگەرایی جیاوازی و لێکنەچوونی ڕوون و ئاشکرایان لەنێواندا هەیە، چونکە هەریەك لەمانە فەلسەفەیەکی تایبەت بەخۆی داناوەو هەڵقوڵاوی ئەزموونی تاکە کەسی خۆیەتی. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ سروشتی بوونگەرایی کە فەلسەفەیەکی نەرم و ئەم هێلمی و نەرمیەی لە ناوەڕۆك قوڵایی خودی بوونگەرایدا ئامادەیی هەیە، بەجۆرێك پەیڕەویکارانی ئەم دیدە فەلسەفیە نکوڵی لەوە دەکەن لەنێو ئەم فەلسەفەیەدا لەتوانادا هەبێت ڕاستی واقعی لە چەند بۆچوونێکی وردو توندوتۆڵدا کۆبکرێتەوە، هۆیەکی دیکەش ئەوەیە تیۆرێکی گشتی یەکانگیر بوونی نیە، کە هەموو بوونگەراکان لە دەوری خۆی کۆبکاتەوە.

واتە بوونگەرایی فەلسەفەیەك نیە ستراکچەرو بونیادێکی تەواوی هەبێت، بەڵکو ڕێبازێکە، یاخود شێوازێکە لە فەلسەفاندن، ئەو کەسەی بەکاری دەهێنێت

وەك میتۆدێك دەگاتە چەند دەرەنجام و ڕاو بۆچوونێك کـە لێکنەچـوو و جیـاوازن لەناو یەکتردا سەبارەت بە جیهـان و ژیـانی مـرۆڤ، بـەلاّم چـەند خەسـڵەتێکی هاویەش لەنێوان بیرمـەندان و پەیڕەوکەرانی ئەم ڕێبـازەدا هەیـە، دەکرێـت بـەم خالاّنە ڕوونبکرێنەوە:-

١- بـوون- الوجـود دەکەوێتــە پـێش ماهیــەت (چـۆنیەتی و ڕاسـتی و ناوەڕۆك).

٢- مرۆڤ خاوەنی بوونە.

٣- مرۆڤ ئازادە.

٤- فەلسەفاندن لە مرۆڤەوە نەك لە سروشتەوە دەستپێدەکات.

٥- ئــەرکی فەلــسەفەی بوونگــەرایی ڕەهــاکردنی مرۆڤــە لــە هــەموو بیرکردنەوەیەکی ئەقڵیانە کە پێشتر هەبوون.

٦- زانین سەرچاوەیەکی واقعە نەك زێرینی.

## پراکتیزە پەروەردەییەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی

لەبەرئەوەی بوونگەرایی شێوازێکی فەلسەفاندنە، کەواتە لە بیرکردنەوەوە نزیکترە تا لەوەی میتۆدێکی هزری دیاریکراو بێت، لەبەر ئەم هۆیەش دیـدێکی فکری تەواوی لە پەروەردەدا نەخستۆتە ڕوو، یـاخود پراکتیزەکردنێکـی قـوڵ و

کاریگەری لە پەروەردەدا پێشکەش نەکردووە، بەڵام بۆچوونی فەلسەفی ئەم ڕێبازە چەندین کاریگەری لەسەر پەروەردەو مامۆستایان و پەروەردەکاران جێهێشتووە، ئاسۆیەکی نوێی بۆ سەرجەم ئەو کەسانە ئاوەڵا کرد کە خەمی سەرەکیان پرۆسەی پەروەردەیە. ئەم کاریگەریانەش بوونە هۆی هەوڵدانێکی زیاتر بۆ بیرکردنەوەو ڕاڤەکردنی کێشە پەروەردەییەکان و چالاکییە جیاوازەکانی ئەم پرۆسەیە ئاڕاستە دەکەن.

بەهۆی ئەو بایەخەی ئازادی تاکە کەسی هەیەتی لە پەروەردەی بوونگەرایدا، وای کردووە هەندێک لە پەیڕەویکارانی ئەم ڕێبازە بانگەشە بۆ پەروەردەی تاکە کەسی بکەن لەبری ئەو پەروەردە بەکۆمەڵەی لە ئێستادا باوە، پەروەردەی تاکە کەسیش واتا بەسەنتەرکردنی تاك لە پرۆسەی فێربووندا و پەرەدان بە خودێتی تاك و ئاوەڵاکردنی تواناکانی و بەئاگاهێنانەوەو وشیارکردنەوەی. لەم خاڵەوە پەیوەندی نێوان بوونگەرایی و پەروەردە بەرجەستە دەبێت. کاریگەری سەرەکی ئەم دیدە فەلسەفیە بەسەر پەروەردەوە دەردەکەوێت...

سەرەتا بە کەمکردنەوەی کۆت و بەندی سەر منداڵ خۆی نواند. پاشان ئازادکردنی فێرخوازان لە دەسەڵاتی ملکەچبوون بۆ مامۆستاو گەورەکان، سەرەڕای ڕزگارکردنی خوێندنگا لە و دەسەڵاتە کۆمەڵایەتیەو کارکردن لەسەر دڵنیابوون لە ئازادیی و سەربەخۆیی پرۆسەی خوێندن، هەروەها پارێزگاری لە

بوونی تایبەتی خۆی واتە (فێرخواز) بێتەوەی لەناو کۆمەڵدا پلەوپایەی خۆی لەدەست بدات.

پەیڕەویکارانی فەلسەفەی بوونگەرایی خەڵکیان لە خاڵی لاوازی مرۆڤ ئاگادار کردەوە کە بایەخ بەم لایەنە بدەن، چونکە بۆ چەندین سەدە دەبوو ئەم خاڵە پشتگوێ خرابوو، ئەویش بەئاشکراکردنی حاڵەتەکانی ڕاڕایی و دڵەڕاوکێ و گوناهباری و ترسنۆکی و خۆونکردن و مەرگ، بوونگەرایی ئەم حاڵەتانەی کردە بابەتی لێکۆڵینەوەو بەدواداچوون سەرەڕای چەندین مەسەلەی گرنگی دیکە کە بوونگەرایی دەربارەیان هۆشداری دایە مرۆڤ.

دەتوانرێت بەرجەستەترین پراکتیزەکردنەکانی بوونگەرایی لە بواری پەروەردەدا لەم خاڵانەدا کورت بکرێنەوە:-

## ١- ئامانجە پەروەردەییەکانی فەلسەفەی بوونگەرایی:-

ئامانجی هەرە باڵای ئەم ڕێبازە فکریە لە پەروەردەدا یارمەتیدانی تاکە کەسە لە گەڕان بەدوای خودی خۆیدا، ئەمیش بەهۆی ئامادەسازی بۆ دروستبوونی تاکێکی ئازاد ڕێز لە ئازادی تاکێتی خۆی بگرێت، هەروەها بەرپرسیارێتی کردەوەو ڕەفتارەکانی خۆی لەئەستۆ بگرێت (واتە ئەو ڕەفتارو کردوانەی فێرخواز بە ویست و ئارەزووی خۆی هەڵیان دەبژێرێت).

کەواتە دەردەکەوێت پێوەری پەروەردەی سەرکەوتوو لە دروستکردن و پێکهێنانی سێ کردەوەی ژیرییە لای تاکی فێرخواز، ئەوانیش:-

أ- پەروەردەکردن و سیستم.

ب- ڕەخنەگرتن.

ج- گەشەسەندن.

هەر لەرێی پەرەدان بە وشیاری و درککردن بە هەڵبژاردنی ئەو شێوازەی دەیەوێت بژی، ئەوا بەهۆی ئەمەوە بەرپرسیارێتی دەخاتە ئەستۆی خۆی لە پێکهێنانی تاکێتی و سەربەخۆبوونی. کاتێك تاك زانی ئەوا هەڵدەبژێرێت، وە بڕیار دەدات ئەو کارە بکات کە دەیزانێت، کەواتە هەڵبژاردن کردەیەکی بەهادارانەیە، چونکە لەرێی وشیارییەکەوە ئەنجام دراوە، کە لەتوانایدا بووە بەراورد بکات لەنێوان ئەو شتانەی لەبەردەستیدا بوون، بەمەش مانایەك دەبەخشێتە زانینەکانی، بەجۆرێك لەتوانایدا بێت لێهاتوویی و شارەزاییەکانی خۆی بناسێتەوە. ئەو کردەوانەی ئەم جۆرە تاکانە هەڵی دەبژێرن ئاماژەدەرن بە خودی (زانین)ی ئەو کەسە، ماناش دەدەنە (بوون - الوجود)وە چارەنووسی مرۆڤەکە، هەربۆیە ئامانجی خوێندنگە دەبێت پەرەدان بێت بە تاکی ئازاد، ئەمیش بە ڕەخساندنی ژینگەیەك ئاوەڵاکەرو بەرجەستەکەری لێهاتووەکانی بێت، وە ڕابهێنرێت لەسەر پرسیارکردن و ڕەخنەگرتن و ڕاڤەو شیکارکردن، چونکە ماهیەتی ئەم تاکە کەسە ناتەواوەو پێویستی بە کرانەوە هەیە بەرووی کەسانی

دیکە، بۆیە دەبێت سەربەستی ڕەهای بدرێتێ تا بتوانێت سنورەکانی خودی خۆی بەپێی ئەو چاوەڕوانیەی بەرامبەر بەخۆی هەیەتی دیاری بکات، هەروەها بۆئەوەی جەخت لەسەر ئازادی تایبەت بە خۆی بکاتەوەو بەرپرسیارێتی هەڵبژاردنی کردەوەو ڕەفتارەکانی خۆی لەئەستۆ بگرێت.

## ٢- پرۆگرام (بابەتەکانی خوێندن) لە فەلسەفەی بوونگەراییدا :-

لەبەرئەوەی زانین (المعرفة) پرۆسەیەکی خودیەو گرێدراوی ئەو تاکە کەسەیە کە درکی پێدەکات، تاکە کەسیش زانینەکانی تا ئێستاش دیاری نەکراوە، ڕاستیش بەندە بە خودێکی زانیار (العارف)، کەواتە نابێت پرۆگرامێکی دیاریکراو بسەپێنرێت بەسەر فێرخوازدا، چونکە کەشتی گرنگ لێرەدا فێرخوازەکەیە نەك پرۆگرام، بۆیە دەبێت پرۆگرامی خوێندن ئەو زانست و زانیاریانە لەخۆ بگرن کە کورتکراوە هەڵێنجراوی واقع و پراکتیك بێت، ئەگەر ئەو زانست و زانیاریانەی دەدرێتە فێرخواز پێویستیان بە تەواوکاری هەبێت و پەیوەست بن بە حەزو ویست و بایەخەکانیەوە، ئەوا دەبێت لەلایەکی ترەوە بەو جۆرە بن گفتوگۆو گۆڕان و تێبینی لەسەردانیان تێدا بەرجەستەکرابێت بۆئەوەی فێرخواز لەتوانایدا بێت بگاتە قوڵایی و ناوەڕۆکی زانین و بەدوای خودی خۆیدا

بگەڕێت و توانا شاراوەکانی بدۆزێتەوەو ئەو پرۆگرامەی لا ببێتە شتێك کە تایبەت بە خۆیەتی.

چونکە بەجۆرە فێرخواز دەتوانێت بابەتەکانی خوێندن بکاتە کۆمەڵە زانستێك لەگەڵ خودی خۆیدا یەکانگیر بێت، وە درك بەوە بکات ئەرکێکی هەرە گرنگ و پرپایەخیان هەیە لە جێبەجێکردنی کارو پێداویستیەکانی ژیانی، بۆیە پرۆگرامی خوێندنی بوونگەرایانە دوو ڕەهەند لەخۆ دەگرێت کە ئەمانەن:- یەکەم، ڕەهەندی مەعریفی. دووەم، ڕەهەندی پێوانەیی.

لایەنە مەعریفیەکە ئەو زانیاریانە لەخۆ دەگرێت کە پەیوەستن بە دیاردە سروشتی و کۆمەڵایەتیەکانەوە، بەڵام ڕەهەندی پێوانەیی ئەو زانیاریانە لەخۆ دەگرێت کە خەسڵەتێکی ئاکارییان هەیە وەك زانستە مرۆییەکان (مێژوو، جوگرافیا، ئابووری، کۆمەڵناسی، ئەدەبیات، فەلسەفە، ئایین...)، بەلام بوونگەراکان زیاتر بایەخ دەدەنە لایەنی پێوانەیی وەك بنەماو پێکهێنەری بابەتەکانی خوێندن لە سەروو هەمووشیانەوە بابەتە ئەدەبیەکان. لە کاتێکدا ئەمانە لە پلەوپایەی خوێندنی پیشەیی و ڕاهێنانەکان کەم دەکەنەوە لەو ڕووەوە تێی دەڕوانن کە هۆکارێکی گرنگن لە بەڕێوەبردنی گوزەراندا، بەڵام بایەخێکی زۆر دەدەنە یاری و چالاکیەکان وەك بەهایەکی پەروەردەییانەی تاکە کەسەکان بۆ ڕەخساندنی ئازادی و سەربەخۆی کەسێتی.

بە بۆچوونی ئەوان باشترین قۆنـاغ و کـات بـۆ پراکتیزەکردنـی بوونگـەرایی قۆناغەکانی دواناوەندی و زانکۆیە، چونکە وشیاری فێرخواز گەشتۆتە لوتکە لەم قۆناغەدا بایەخیش دەدەنە شارەزایی و لێهاتووییە کاراو چالاکەکان.

### ٣- شێوازی وانەوتنەوە لە فەلسەفەی پەروەردەیی بوونگەراییدا:-

بوونگەراکان ڕەخنەیەکی توند لە شێوازە باوەکانی دیکـە دەگـرن و بـە ناتەواویان دادەنێن. بە بۆچوونی ئەمان باشترین شێوازی وانەوتنەوە بەکارهێنانی شێوازە سوقراتیەکەیە، چونکە فێرخواز دەتوانێت تواناو لێهاتوویـیـەکانی خـۆی دەربخات، ئەویش بە وروژاندنی پرسیارەکان و گفتوگۆو ڕاڤەکردن و شـیکردنەوە، ئەمانەش لەسەر ئەزموونی کەسێتی و تواناکانی خود بنیات تراون. ئەم شـێوازە هانی فێرخواز دەدات سـەبارەت بـە ڕاو بۆچـوون و هەڵبژاردنـەکانی خـۆی، وە بەشێوەیەکی گشتی هاندەری خودە.

هەروەها بوونگەراکان وای بۆ دەچن کە دەتوانرێـت شـێوازی چارەسـەری گرفتەکان (حل المشاكل)ی جۆن دیوی لە وانەوتنەوەدا پشتی پێ ببەسترێت، بەڵام پاش هەندێ گۆڕانکاری بەسەر ئەو تیۆرەدا، بۆ نموونە لە کـاتی پێـشنیارکردنی چارەسەری گرفتێك پێوەری هەڵبژاردنی تاکە کەس بکرێتە بنەمایەکی سـەرەکی لە پرۆسەی فێرکردندا.

پەیڕەوکارانی ئەم ڕێبازە فکریە سورن لەسەر ئەوەی پرۆسەی فێرکردنی تاك و تاکێتی فێرکردن، واتە گرنگیدان بە تاکە کەس و خواست و ئارەزووەکانی ڕێزیان لێ بگیرێت، بەو جۆرەش مامەڵەی تاکە کەس بکرێت کە بوونەوەرێکی ئازادە، نابێت سزای دەرەکی بدرێت، چونکە ئەم حاڵەتە وا لە سزادراو دەکات لە گوناهکردنێکی ناوەکیدا بێت.

## ٤- هەڵسەنگاندن :-

بوونگەراکان تاقیکردنەوە بابەتیەکان ڕەتدەکەنەوەو ڕەخنە لە پێوەری ئەکادیمی و پیشەیی، یاخود ڕاهاتنی کۆمەلایەتی بۆ هەڵسەنگاندنی فێرخواز دەگرن، لە گەڵ ئەمەشدا هیچ جۆرە شێوازێکی دیکە پێشنیار ناکەن، لە چوارچێوەی ئەو گرنگیدانەی بۆ مامۆستا هەیانە، خوازیارن مامۆستایان بواریان پێبدرێت شێوازی گونجاو لەبار هەڵبژێرن بۆ هەڵسەنگاندنی فێرخوازەکانیان، پێوەرشیان بۆ ئەم هەڵسەنگاندنە ئاوێتەکردن و ئاشتکردنەوەی فێرخوازانە بە خوێندنەوە، هەروەها ناساندنی گرفتە ڕاستیەکانی مرۆڤ و ڕادەی گەشتنیان بە بردودان بە تواناو ئازادی تاکە کەسێتی پێکهێنانی (بوون)ی خودی. ئەمانەی باسکران دوا ئامانج و مەبەستی پەروەردەو فێرکردنن لە فەلسەفەی بوونگەراییدا بەشێوەیەکی گشتی.

## ٥- پلەو پایـــەی مامۆســـتا ( پێگــەی مامۆســـتا ) لـــە فەلـــسەفەی بوونگەراییدا :-

بەهۆی ئەو پێگە هەستیارەی مامۆستایان لە پرۆسەی خوێندندا هەیانـە، بوونگـەراکان بایـەخێکی زۆر دەدەنـە ئـەم توێـژەو لـە پراکتیزەکردنـی ئـەم فەلسەفەیەدا تەواو پشتیان پێ دەبەستن.

مامۆستای پەیڕەوکاری ئەم فەلسەفەیە هەڵگری کۆمەڵە خەسڵەتێکە، لەپێش هەموویانەوە تاکێتی ئازادو سەربەخۆو خودێکی وشیار، هەروەها دەبێت خاوەنی کەسایەتیەکی بەهرەمەندو هەست بە رۆڵی پڕبایەخی خۆی بکات، چونکە ئەمە هەڵدەستێت بە فێرکردنی کەسانی دیکە، وە رێز لە هەڵبژاردنەکانیان و خودیـان دەگرێت، دەبێت ئەوەش بەهەند وەرگرێت کە هەر فێرخوازێك لـە فێرخـوازێکی دیکە جیاوازەو لەتوانایدا نیە کەسێك دابنرێت لە جێگەی یەکێکی تریان. کەواتە بەجۆرە مامەڵە لەگەڵ هەر کامێکیان وەك خاوەن خودی دەکات، مامۆستاش پێویستە یارمەتیدەر بێت لە دۆزینەوەی ئەو خودەدا، ئەمەش بەو مانایەی کـە مامۆستا لە سەروو زانین و ئەقڵ و خوێندنگاوە بێت.

مامۆستای سەر بەم رێبازە دەبێت ئەوە بزانێت فێرکەری مرۆڤی ئـازادە نەك مرۆڤی زانیارو ئاسایی و لاسایکەرەوە، بۆئەوەی ئەم خەسڵەتەی تێـدابێت پێویـستە رێـز لـە خواسـت و حـەزو ئارەزووەکـانی فێرخـواز بگرێـت، لەگـەڵ

فێرخوازەکان پەیوەندییەکی توندوتۆڵی هەبێت، ئەمەیە یارمەتیدەری مامۆستا دەکات لە بوونی کاریگەرێتی بەسەر فێرخوازەکانەوە سەرەڕای پێشکەشکردنی هاوکاری و یارمەتیدانیان لە هەڵبژاردن و بڕیارەکانیان، دەبێت مامۆستا بەو جۆرە ڕابەرایەتی فێرخوازەکانی بکات کە پابەندن بە بەهاو کەسایەتی خۆیان لەنێو کۆمەڵگەدا.

لەپاڵ ئەمانەی باسکران دەبێت مامۆستا بەشێوەیەکی گشتی ئەم سێ ئامانجە بێنێتە دی:-

یەکەم:- خستنەڕووی بابەتەکان بەو جۆرەی ڕاستیەکان ئاشکرا دەکەن، ئەمیش لەڕێی بەکارهێنانی شێوازی وەبیرهێنانەوەیەکی ئازادانە.

دووەم:- کارکردنی خۆبەخۆیانەی چالاکییە ژیریی و سۆزداریەکان، بۆ ئەوەی فێرخواز بگەیەنێتە کەسایەتی ئازادو هەستی چاکەخوازی خۆبەخۆ ببزوێت بەجۆرێك پشت بە خۆی ببەستێت.

سێیەم:- دڵنیابوونی مامۆستایان لەوەی خوێندکارەکانی پابەندی ئەو ڕاستی و زانیاریانەن کە خۆیان بڕوایان پێ هێناون پاش بیرکردنەوەیەکی قوڵ و ورد لەم ڕاستیانە.

لەگەڵ ئەو هەموو باڵایی شکۆمەندیەی بیرۆکەکانی بوونگەرایی، وە هێنانەدی ئەو دەرەنجامە پڕبایەخانەی لە بواری پەروەردەییدا کە ڕۆڵێکی مەزنیان هەبووە لە چاکسازیکردنی هەندێك بواری پەروەردەیی، بەڵام هەندێك خاڵی

نێگەتیڤ و ناتەواو لەم بیرۆکانەدا بەرجەستە دەبوون، لەو خاڵانەش:- پێداگرتن و زیادەڕەوی لەسەر تاکێتی مرۆڤ و ئازادی هەڵبژاردنەکانی. ئەم خاڵەش لە ڕاستیدا دەکاتە پشتکردنە بەرژەوەندی کۆمەڵگاو پاشانیش ئازادی هەڵبژاردن بۆ پێکهاتەی ڕاستی و جەوهەری تاکە کەسی لە بۆشاییەوە نایەتە بوون، بەڵکو لەنێو کۆمەڵگەو ڕۆشنبیری کۆمەڵدا دێنە ئارا، ئەم کارەش خۆلادانێکی هەڵەو خەوشدارو ناتەواوە.

لەلایەکی دیکەوە بوونگەرایی زیادەڕەوی دەکات لەسەر خودێتی تاکە کەس و هانی دەدات پشت بە ژیانی خۆلەدەستدان و ڕاڕایی و خەمۆکی ببەستێت، ئەمانەش دەبنە هۆی زاڵبوونی دیدێکی ڕەشبینانە لە ژیاندا، وە پووچگەرایی بەرهەم دێنێت و ژیان و جیهان بە دۆزەخ و دوژمن دادەنێت، ماهیەتیش لای بوونگەراکان بە مەرگ نەبێت تەواو نابێت، ئەمانەش کە باسکران ئەو مانایە دەدەن بوونگەرایی لە هەوڵی ئاوێتەکردنێکدا بێت لەنێوان پەروەردەیەك بۆ ژیان و پەروەردەیەك بۆ مەرگ. خاڵێکی تر جێگەی ڕەخنە بێت لە فەلسەفەی بوونگەراییدا ئەوەیە زۆرێك لە بەهاو پێوەرە کۆمەڵایەتیەکان ڕەت دەکەنەوە. ئەم بەهاو پێوەرانەش ماوەیەکی زۆریان ویستووە تا بچەسپن و ببنە یاساو ڕێساگەلێك ژیانی تاك و کۆمەڵگەیان پێ ڕێکبخرێت و خەسڵەتی گشتێتی و هاوبەش دەبەخشنە ژیان.

## حەوتەم– فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم (الوضعية المنطقية)

## posistivism

پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی یا ئەزموونگەری لۆژیکی، هەندێك وا بەباش دەزانن بە ئەزموونگەری زانستی ناوببرێت، ئەمیش ڕێبازێکی فەلسەفیە لە سەدەی بیستەمدا دەرکەوتووە، لە یەك کاتدا لۆژیك و فەلسەفەو زانست پێکەوە گرێدەدات بۆ نەهێشتنی و لابردنی تێکەڵی و ئاڵۆزی ژیان، ئەویش بە ڕاڤەکردنی پەیوەندییە دەرەکیەکان و ڕوونکردنەوە یان بۆ مانای وشەکان و بیرۆکە زانستیەکان بۆئەوەی لە ناوبردن و سڕینەوەی گرفتە ساختەکان و چەمکە بێ ماناو کێشە نادروستەکان، وەك پەیڕەوکارانی ئەم ڕێبازە بۆی دەچن، بانگەشەی دۆزینەوەی فەلسەفەیەکی زانستیانەی لەو جۆرەیان دەکرد لەسەر یەکبوونی زانستەکان بوەستێت، فەلسەفەش لە بابەتە سواوو باوەکان ڕەها بکات.

ئەمان ئەرکی فەلسەفەیان کردبووە گرێدانەوەی زمان بە ئەزموونەوە بەشێوازێکی زانستیانە، سەرەڕای دارشتنەوەی واقعی دەرەکی بەشێوەیەکی لۆژیکیانە. ئەویش لەڕێی بەکارهێنانی میتۆدی شیکارکردنی لۆژیکیانە نەبێت نایەتە دی، بە سودبینین لە بەهای ڕێبازی ئەقڵیانەو ئەو شتانەی لەڕێی ژیریێژیەوە سەلمێنراون و کۆدەنگیەك هەیە لەنێوان میتۆدی زانستی ئەزموونی و سروشتدا، ئەمەش لەپێناو دەرەنجامێك کە خەسڵەتی وردی و ڕوونی و ڕێکی و

بابەتیبوونی هەبێت. فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم لایەنی ئەزموونی وەك درێژەدانێك بوو بە میتۆدی زانستیانەو لایەنە ئەقڵیەکەی، هەروەها درێژەدان بوو بە لایەنی ماتماتیکیانەو لۆژیکی، دوا دەرەنجامی ئەم کارەش هاتنەکایەی زمانێکی ئاماژەیی (هێمایی) جیهانی بوو کە یەکبوونی مەعریفی هێنایەدی.

زانای نەمسایی (شیلیك) یەکەمین دامەزرێنەری پۆزەتیڤیزمی لۆژیکی بووە، پاشان ئەم ناوەی لەم ڕێبازە فەلسەفیە ناوە کە لە (بازنەی ڤیەنا) ساڵی (١٩٢٤) دامەزرا، بە ڕابەرایەتی شیلیك بووە، ناسراوترین پەیڕەویکارانی ئەم ڕێبازە فکریە (کارناب، فیلیپ، فرانك، ئەلفردایر)ە.

بەپێی ئەوەی باسکرا ناکرێت ناوی فەلسەفە بەسەر پۆزەتیڤیزمدا ببڕێت بەمانای تەواوی فەلسەفە، چونکە دژی پێکهێنانی تیۆری فەلسەفی بووە، وە شێوازێکی بیرکردنەوەو ڕاڤەکردن بووە پشتی بە زانست دەبەست وەك بنەمایەك، فەلسەفەی دادەنا بە شوێنکەوتەی ئەو زانستەو بواری دەدایە زانست بەپێی بنەمای یەکێتی زانین ئاڕاستە وەربگرێت، گەر زانست جۆرێك بێت لە شێوازەکانی زانین (المعرفة) ئەوا وتەزاگەلێك لەخۆ دەگرێت کە ئاڕاستە دەدەنە ئەو زانستە، ئەمیش بەپێی ئەوەی ئەو چەمك و تێگەشتن و ڕاستیانەی زانست پێیان دەگات و دەیانکاتە دراوێکی زانستیانە، ئەوا لە بنەڕەتدا ڕیشەیەکی فەلسەفیان هەیە.

لەو ڕووەی کە فەلسەفە دیدێکی گەردوونیە، کەواتە زانست دەبێت پشکێکی لەم کایەدا هەبێت، زانینەکانی لە چوارچێوەیەکی یەکێتی تەواوکاریدا ئاڕاستە دەکات، کەواتە فەلسەفە کار لەسەر یەکێتی زانست و چەسپاندنی ئەم یەکێتیە دەکات و تەواوکاریشی بۆ ئەنجام دەدات. واتا فەلسەفە بە کارکردن پێش دەکەوێت و لەلایەکی دیکەوە دەگەڕێتەوە بۆ ئاڕاستەکردن و ڕێنماییکردنی ئەو زانستە.

لە ڕاستیدا پۆزەتیڤیزم وەك تەوژمێکی فەلسەفیانە لە کۆتایی سەدەی نۆزدەهەمین دەرکەوت، بەڵام لە سەدەی بیستەمدا بڵاوبووەوە. ئەم فەلسەفەیە هەموو گرفتە ساکارو سادەو باوەکانی فەلسەفە ڕەتدەکاتەوە، چونکە بە گرفتی ئایدیاییان دادەنێت و ناتوانرێت بە ئەزموونکردن ڕاستی ئەم گرفتانە بهێنرێتە دی، کەواتە ناشکرێت چارەسەری بۆ دانرێت.

ئەم ڕێبازە فەلسەفیە بە سێ دۆخی بەرەوپێشچووندا تێپەڕیوە کە ئەمانەن:-

١- دەرکەوتنی پۆزەتیڤیزمی فەرەنسی لەسەر دەستی (ئۆگست کۆنت)، ئەمیش لە کتێبە بەناوبانگەکەی (چەند وانەیەك لە فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم).

٢- دۆخی دووەمی پێشکەوتنی ئەم ڕێبازە لەسەر دەستی فەیلەسوف (باخ)دا ڕوویدابوو.

٣- بەلاّم لە دۆخی سێیەمدا گۆڕا بەو ڕێبازەی کە بایەخ و گرنگی دەدا بە شیکردنەوەی زمانەوانیەکان، جەختیش لەسەر ڕاڤەکردنی لۆژیکیانەیان دەکاتەوە.

پۆزەتیڤیزم لەو خاڵەوە دەست پێدەکات کە فەلسەفە خزمەتە بە زانست لەڕێی ڕاڤەکردنێکی لۆژیکیانەی وشەو چەمکەکان، هەروەها ڕوونکردنەوەو ئاشکراکردنی دەستەواژەو بیرۆکە زانستیەکانە بەهۆی زانستی مانای زمان و زانستی بونیادی زمانەوە.

بەهەرحاڵ ناوەڕۆکی ئەم فەلسەفەیە، یاخود کورتکراوەی هزری سەرەکی پۆزەتیڤیزم بریتیە لە باوەڕاهێنان تا دوا پلەی باوەڕ بە زانست، بە بۆچوونی ئەمان کێشە فەلسەفیەکان هیچ مانایەکیان نیەو گرفتەکانی فەلسەفەش لە بنەڕەتدا گرفتی ڕاستەقینە نین، چونکە لە یاریکردنێك بە وشەکان زیاتر نین. دەبێت فەیلەسوفان دەست هەڵگرن و خانەنشین بکرێن و زانایان جێیان بگرنەوە، چونکە هەر زانایانن دەتوانن دوای کێشە فەلسەفیەکان بکەون و شیکردنەوەو ڕاڤەکردنی بیرۆکەو دەستەواژە زانستیەکان و لێکدانەوەی وردو قوڵ بۆ واقع و گەشتن بە زانینی یاساو ڕێسا بابەتیەکان ئەنجام بدەن، بەم کارەش زانست لە دەستی فەلسەفە ڕەها کراو لەڕێی زانستی ماتماتیکیەوە ئەم پەیوەندیەی پاراست، هەر لەم کاتەشدا زانست دووبارە داڕشتنەوەیەکی نوێی ئەو چەمك و بیرۆکانە کردەوە کە فەلسەفە بەکاری دەهێنان، هەروەها هێماو ئاماژەکانی دیاری دەکردن بەهۆی

بالادەستی ڕاڤەکردنێکی لۆژیکیانەی تازەوە بۆ ئەزموونکردن و سەرنجدانی دیاردەکان تا ڕوون و ئاشکراتر بن.

بە بۆچوونی ئەم ڕێبازە جیهانی سروشتی سەرچاوەی زانینە مرۆییەکانە، ئەمەش بە وەستان لەسەر سنوری واقعی هەستپێکراو بەبێ تێپەڕاندنی، مرۆڤیش لەڕێی واقعەوە زانیاریەکانی بەدەست دێنێت. تیۆری زانین (نظریة المعرفة) لەسەر دەرئەنجامەکانی زانست بونیاد دەنرێن، زانینیش لای ئەمان زانستی ئەزموونکراوە، کەواتە هۆو ئامرازی زانین هەستەکانن، وە بۆ زانین هیچ سەرچاوەیەکی دیکە نیە جگە لەم هەستانە.

## پراکتیزە پەروەردەییەکانی پۆزەتیڤیزم

وەك پێشتر باسکرا ئەم ڕێبازە فەلسەفە نیە، بەڵکە شێوازێکی بیرکردنەوەو ڕاڤەکردنەو بە زانستەکان پشت دەبەستێت وەك بنەمایەك. کەواتە فەلسەفەیەکی پەروەردەییانەی پێشکەش نەکردووە، بەلام ئەم ڕێبازە بۆ خۆی ناوەڕۆکێکی پەروەردەییانەی هەیە، بۆ نموونە شێوازی شیکردنەوەو لێکدانەوەی لۆژیکیانە بۆ ڕووداوو چەمك و تیۆرە هەستپێکراوەکان، ئەمانە سودێکی زۆریان گەیاندووە بە پرۆسەی پەروەردەکردن، سەرەڕای هێنانەکایەی سیستمێکی

فێرکاری لەو جۆرەی کە پشتی بە زانست بەستووە. کە ئەم کارە ڕۆچووتە نێو پرۆسەی پەروەردەو فێرکردنەوە.

دەتوانرێت بە چەند خاڵێکی دیاریکراو سودو کاریگەری فەلسەفەی پۆزەتیڤیزم لە بواری پەروەردەدا کورت بکرێتەوە:-

١- بەشدارە لە دیاریکردنی ئامانج و هزرە پەروەردەییەکان، توانای بەدیهێنان و جێبەجێکردنیان دەبەخشێتە ئەو هزرو ئامانجانە، ئەویش لەرێی ڕاڤەکردنی: چەمك، یاسا، مانا، دراو، ئەگەر، ڕستە، دەستەواژەکانی.

هەروەها کاریگەریان لەسەر زانایانی دەروونناسی و پەروەردەیدا هەبووە بەو جۆرەی کە یارمەتیدەریان بووە لە دیاریکردنی ئامانجی پەروەردەییانەو شیکردنەوەی ناوەڕۆك و ئامرازەکانی، وە گرێدانەوەی شێوازی وانەوتنەوە بە لێکۆڵینەوەی زانستیانە، سەرەڕای کاریگەرێتیان لەسەر مامۆستایان بۆ دیاریکردنی چەمك و ماناو زاراوەکان و ئاماژەکان و دابەشکردنی وانە بۆ چەند قۆناغێك بەو جۆرەی توانای سەرکەوتنی مامۆستایانی فەراهەم کردووە لە ئەرکەکانیدا.

٢- یارمەتیدەرە لە دروستبوون و دامەزراندنی تیۆرگەلێکی فێرکردنی بەرنامەرێژکراو، هەروەها بۆ شیکردنەوەی کاریگەری ئەو دیالۆگ و ئاخاوتنەی نێوان مامۆستاو فێرخواز، یا لەنێوان خودی فێرخوازاندا، سەرەڕای کاریگەرێتی لەسەر شێوازەکانی تێبینیکردن و پێوانەکاری و هەڵسەنگاندن و ڕێنماییکردن.

٣- پشتگیریکردن لە ڕێبازی ئەنجامدانی ڕاڤەکردن و لێکدانەوەی زانستە کۆمەڵایەتیەکان بەتایبەت لە قوتابخانەی ڕەفتاری (المدرسة السلوكية) و زانستی دەروونناسیدا، ئەمەش بە ئاشکرا لە لێکۆڵینەوەی بابەتەکانی خوێندن (پرۆگرام) لای ڕێبازی (برۆنەر)دا دەرکەوتووە، کە قوتابخانەیەکە کاری سەرەکی بریتیە لە ڕاڤەکردنی بابەتەکانی خوێندن، هەروەها کاریگەری لەسەر لێکۆڵینەوەکانی ڕێبازی (بلوم) بۆ ئامانجە پەروەردەییەکان هەبووە.

لە کۆتاییدا بەباش دەزانرێت ئاماژە بە بوونی هەندێك فەلسەفەی پەروەردەییانەی دیکە بدرێت، کە کاریگەری بەرچاویان لەسەر پرۆسەی پەروەردەو فێرکردندا هەبوە، بەلام هەر هەڵقولاوی فەلسەفە بەرجەستەو باوەکانی دیکە بوون، وەك فەلسەفەی ئایدیایی، واقعی، پراگماتیزم یاخود هەر درێژەپێدانێکی ئەم فەلسەفانە بوون، هەرچەندە ئەزموون و پراکتیزەی تایبەت بە خۆیان هەبووە، جگە لەمەش ئەم فەلسەفە پەروەردەییانەی دەمانەوێت ئاماژەیان پێ بدەین پەیوەستن بە مێژووی پەروەردەیی بابەتە مرۆییەکان.

ئەگەر ئەمانەش ئاوێتەیەك بووبن لە فەلسەفەکانی ئایدیایی و واقعی و پراگماتیزمی، ئەوا بوونەتە ئەو پایە سەرەکیەی چالاکییە پەروەردەییەکانی ڕێکخراوە جیهانیەکانیان لەسەر وەستاوە، ڕێکخراوی یونسکۆ بەرجەستەترین نموونەیە....

## سوپاس و پێزانین...

مامۆستاو شاعیر (عەلی پێنجوێنی) ئەرکی پیاچوونەوەی زمانەوانی لەئەستۆ گرت. یارمەتی و هاوکاری جێگەی ڕێزو پێزانینە...

## زنجیرەی کتێبە چاپکراوەکانی دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم ساڵی ٢٠٠٨

| ناوی کتێب | نووسینی | وەرگێڕانی |
|---|---|---|
| ٤٢٠-ئامالّی ڕەخنەو داهێنان | ڕزگار سەعید | |
| ٤٢١- ئەمریکاو ئەنفال | سەمنسا پاوەر | بەختیار کەریم |
| ٤٢٢- ڕای گشتی | د.عامر حەسەن | ئاکۆ فاتیح |
| ٤٢٣- مەزرای ئاژەڵان | جۆرج ئۆرویل | ئەدیب نادر |
| ٤٢٤- فەنتازیای گەڕانەوە | عەتا قەرەداخی | |
| ٤٢٥-ئاودارانی موزیکی جیهانی | زۆزک قەرەداغی | |
| ٤٢٦-لە ژێر ئاسمانی بەستەڵەکدا | جاک لەندەن | شێخ عەلی شێخ محەمەد بەنا |
| ٤٢٧-حیکایەتە نەمرەکانی گەلی جولەکە | | زاگرۆس زەردەشتی |
| ٤٢٨- لە شانۆی ئەبسێردەوە: | ساموێل بیکێت | بەختیار سابیر حەمە |
| * ڕۆژە خۆشەکان | هارۆڵد پینتەر | |
| * خۆڵەمێش بۆ خۆڵەمێش | | |
| ٤٢٩- لە شانۆی فەرەنسییەوە: | یۆژین یۆنسکۆ | عەلی کەریم |
| *پادشا دەمرێت | | |
| *چوارینە | | |
| ٤٣٠- حەوت شانۆنامە بۆ منالآن | ئەحمەد ئیسماعیل ئیسماعیل | هەورامان وریا قانع |
| ٤٣١- پێشەوایان و بەکرێگیراوان | محەمەد ئەلباز | ئەحمەد سەلام |
| ٤٣٢-ئاهەنگی جەژنی لە دایکبوون | هارۆڵد پینتەر | عەلی عوسمان یاقووب |
| ٤٣٣-فەرهەنگی شانۆ | ئا:یاسین قادر بەرزنجی | |
| ٤٣٤-چەمکی چاکسازی لە کوردستاندا | ڤینۆس فایەق | |
| ٤٣٥-پەیوەندییەکانی کوردستان و ئازەربایجان و ... | د.ئافراسیاو هەورامی | |

**سەرچاوە :**

(في فلسفة التربية)

تأليف/ د. أحمد علي الحاج محمد ( استاذ التخطيط التربوي)

مؤسسة: دار المناهج للنشر و التوزيع

الطبعة الثانية (٢٠٠٣)

عمان — الاردن

ناوی کتێب: فەلسەفەی پەروەردە

نووسینی: د. ئەحمەد عەلی ئەلحاج محەممەد

وەرگێڕانی: تەها محەممەد ئەمین قەرەداغی

بابەت: پەروەردەیی

مۆنتاژی کۆمپیوتەر: سەیران عەبدولرەحمان فەرەج

هەڵەچنی: سارا عەبدوڵڵا

تیراژ: ١٠٠٠دانە

نرخ: ٢٥٠٠ دینار

ژمارەی سپاردن: ٨٨٠ ی ٢٠٠٧

دەزگای چاپ و پەخشی سەردەم

چاپی : یەکەم ساڵی ٢٠٠٨

کوردستان -سلێمانی

www.serdam.net

www.serdam.info

